Kurdistan Regional Government
Ministry of Education
G.D. of Curriculum & Printings



حکو... - عیراق
بەڕێ... ەکان

٦

# ڕێزمان و خوێندنەوەی کوردی

بۆ

پۆلی شەشەمی بنەڕەتی



حکومەتی هەرێمی کوردستان - عیراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# ڕێــزمان و خوێندنەوەی کوردی

## بــۆ

## پۆلی شەشەمی بنەڕەتی

دانانی
لیژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردە

بژارکردنی
سادق ئەحمەد عوسمان ڕوستایی
خەسرۆ عەلی حەسەن    ئیسماعیل محەمەد عەبدوڵڵا
نەمام جەلال ڕەشید

چاپی نۆیـەم    ١٤٣٧ کۆچی    ٢٠١٦ زایینی    ٢٧١٦ کوردی

**سەرپەرشتی زانستی چاپ**

**نەمام جەلال ڕەشید**

**سەرپەرشتی هونەری چاپ**

**عوسمان پیرداود**

**خالد سلیم محمود**

**دیزاین و ئامادەکردنی نیگارەکان**

**عادل زرار**

**جێبەجێکردنی بژاری هونەری**

**یوسف احمد اسماعیل**

# پێشەکی

مامۆستای بەڕێز ئەم پەڕتوکەی کە لەبەر دەستتدایە لە ئەنجامی هەوڵ و کۆششێکی زۆر بەم شێوەیە دانراوە و ڕێکخراوە و خراوەتە بەر دەستتان.
ئەم پەڕتوکە جیاوازە لە پەڕتوکە کوردییەکانی پێشتر، تێیدا بابەتی ڕێزمان و خوێندنەوە کراوە بە یەک پەڕتوک. جا بۆ بەشە وانەکانی زمانی کوردی لە خوێندنەوە ودارشتن و لەبەرکردن و ڕێنووس و خۆشنووسیدا، هەر بەشەیان لە خزمەت بەشەکانی دیکەدایە و بەهەموویان زمانە شیرینەکەی کوردی پێکدێنن، بۆیە پێویستە لە دابەشکردنی بەشە وانەکانی زمانی کوردی بەسەر ڕۆژەکانی هەفتەدا هەر لەسەرەتای ساڵەوە گرنگی پێبدرێت و قوتابییان و خوێندکارانی لێ ئاگادار بکرێتەوە.. هیچ بەشێکیان نەکرێتە قوربانی بەشەکەی دیکە.
ئامانج لەم پەڕتوکانە ئەوەیە، کە خوێندکاران بتوانن بە زمانێکی کوردی ڕەوان بدوێن و بنووسن و بخوێننەوە و گەشەی پێبدەن، ئەم ئامانجانە بە هاوکاری هەموو لایەکمان بێتە دی، ئەم پەڕتوکە پێویستییەکی زۆری بە تێبینی و بۆچوون و باری سەرنجی ئێوەی بەڕێزە، بۆیە داواکارین دڵسۆزانە هەڵی سەنگێنن و ڕای خۆتانی لەسەر دەربڕن. ئەگەر هەر تێبینی و کەم و کوڕییەک یان هەر شتێکی لەم بارەوە هەبوو، لە ڕێگەی پەروەردەکان ئاگادارمان بکەنەوە، بۆ ئەوەی گوڵزاری پەڕتوکەکە لە چاپەکانی داهاتوو پوختەتر و گەشاوەتر بێت.
هەر سەرکەوتوو بن..

لیژنەی دانانی پەڕتوک

# ناوەرۆک

١. پێشەکی
٢. ڕستە
٣. جۆرەکانی ڕستە
٤. ڕستە (نیهاد-گوزارە)
٥. ڕستە (بکەر- کار)
٦. تەواوکەر
٧. کار
٨. دەمەکانی کار- ئـ کاری ڕابردوو
٩. دەمەکانی کار-ب کاری ڕانەبردوو
١٠. کاری داخوازی
١١. کاری تێنەپەڕ و کاری تێپەڕ
١٢. جێناوی کەسی سەربەخۆ
١٣. جێناوی کەسی لکاو — کۆمەڵەی (١)
١٤. جێناوی کەسی لکاو — کۆمەڵەی (٢)
١٥. ڕاهێنانی گشتی

# ڕســــته

١. هەولێر پایتەختی هەرێمی کوردستانە.
٢. ئەحمەدی خانی هۆزانڤانەکێ مەزن بوو.
٣. تۆ وانەکەت باش بخوێنە.
٤. ئێوە دەچن بۆ خانەقین.
٥. پێشمەرگە بەرگری لە نیشتمان دەکات.
٦. شاری زاخۆ دەکەوێتە سەر روباری خاپور.

## ڕاڤە:

قوتابی خۆشەویست: بە بیرت دێت، پار لە پۆلی پێنجەمی بنەڕەتی بابەتی (ڕستە)مان خوێند، ئەوا لەم ساڵەدا باسەکە تەواو دەکەین. ئەگەر بە وردی سەرنج بدەینە ئەو ئاخاوتنانەی سەرەوە، دەبینین هەر یەکێکیان واتایەکی هەیە و مەبەستێکی سەربەخۆ دەبەخشێت و بە هەر یەکێک لەو ئاخاوتنانە دەگوترێت ڕستە.

## پێناسە:

ڕستە چەند وشەیەکە پێکەوە واتایەکی تەواویان هەیەو بە هێمایەکی گونجاو کۆتایی دێت*.

## ڕاهێنان (١)

ئەم ڕستانە هەڵوەشێنەوە، بزانە هەر ڕستەیەک لە چەند وشە پێکهاتووە:

١. ژینگەپارێزی ئەرکی هەموانە.
٢. کوردستان خاکی کوردانە.
٣. نەورۆز جەژنی نەتەوەی کوردە.
٤. کەس ناتوانێت دەنگی ئازادی کپ بکات.
٥. پەرلەمانی کوردستان، بەرهەمی خوێنی شەهیدانە.

* مەبەست لە هێما : یەکێک لە نیشانەکانی خاڵبەندییەکە ( خاڵ، نیشانەی پرس، سەرسوڕمان ) دەگرێتەوە.

## ڕاهێنان (٢)

ئەم ڕستانە بە وشەیەکی گونجاو تەواو بکە:

١. باوکم .......... بۆ شارەزوور.

٢. ئازاد .......... دەنووسێت .

٣. .......... زەوی دەکێڵێت.

٤. مامۆستا پەڕتوک ..........

٥. هیوا وانەکەی ..........

## ڕاهێنان (٣)

ئەم وشانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

دەکوڵێت، نیگار، هەویر، دەستکرد، خوێندکار، بازێڕ.



## ڕاهێنان (٤)

لەم نووسینەی خوارەوەدا چوار ڕستە دەربهێنە:

نەورۆز سەری ساڵی کوردییە، ڕێکەوتی (٢١)ی بیست و یەکی مانگی ئادارە، ڕۆژێکی پیرۆزە چونکە نیشانەی خەبات و تێکۆشانی ڕابردووی گەلی کوردە دژی زۆرداری، لەبەر ئەوە بوو بە جەژنێکی نەتەوەیی، هەموو کوردێک شانازی بە نەورۆز دەکات.

حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ ڕێزگرتن لەم جەژنە سێ ڕۆژی کردووە بە پشوی فەرمی، کە خەڵک یادی بکەنەوە وئاهەنگ بگێڕن.

مانگی ئادار، کە سەرەتای وەرزی بەهارە، سروشتی کوردستان بەرگی زستان و سەرما دادەماڵی باوەش دەکاتەوە بۆ دنیایەکی فێنکی پەلکەزێڕینەیی بۆندار، زەوی بە مافووری سروشتی ڕەنگاورەنگ دەهێتە داپۆشین و خەڵکی کوردستان ڕوودەکەنە شوێنە جوان و دڵفڕێنەکانی نیشتمان، کە هەموویان دەبن بە سەیرانگە.

# واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| هۆزانڤان | : | هۆنەر، بوێژ، شاعیر |
| بەرگری | : | بەرەڤانی |
| دەستکرد | : | ب دەستی هاتیە چێکردن |
| یادکردنەوە | : | بیرهاتن |
| پەلکەزێڕینە | : | کۆلکەزێڕینە، کەسکوسۆر |

دهێتە داپۆشین: دادەپۆشرێت.

پەندی پێشینان:

گەورە کە یەک بن میللەت سەر دەخەن
دەڵێن دوو ڕێوی شێرێک کەوڵ ئـەکەن

پیرەمێرد

# جۆرەکانی ڕستە

١. نازدار دەچێتە قوتابخانە.
٢. کێ بۆ کفری چوو؟
٣. شیلان بۆ هەڵەبجە بڕۆ.
٤. هەولێر چەند خۆشە!

## ڕاڤە:

لەم ڕستانەی لای سەرەوە، هەر یەکە واتایەکی تەواوی هەیە بۆ مەبەستێکی جیاواز بەکارهاتووە و بە هێمایەکی گونجاو کۆتایی هاتووە.

لە ڕستەی یەکەمدا ڕاگەیاندنێکی تێدایە.

لە ڕستەی دووەمدا لە مەبەستێک دەپرسێت.

لە ڕستەی سێیەمدا داخوازییەک دەکات، فەرمانێک دەدات.

لە ڕستەی چوارەمدا سەرسوڕمانێک هەیە.

# پێناسە

ڕستە لە ڕووی چۆنییەتی دەربڕینەوە، چوار جۆرە:

١. ڕستەی ڕاگەیاندن: ڕستەیەکە ڕاگەیاندنێک دەگەیەنێت و لە کۆتاییدا خاڵێک دادەنرێت.

٢. ڕستەی پرس: ڕستەیەکە پرسیاری پێ دەکرێت، کۆتایی بە نیشانەی پرس (؟) دێت.

٣. ڕستەی داخوازی: ڕستەیەکە داخوازی پێ دەکرێت، لە کۆتاییدا خاڵێک (.) دادەنرێت.

٤. ڕستەی سەرسوڕمان: ڕستەیەکە سەرسوڕمانی تێدایە، لەدوای وشەی سەرسوڕمان یان لە کۆتایی ڕستەکە نیشانەی سەرسوڕمان (!) دادەنرێت.

## ڕاهێنان (١)

بۆ هەر جۆرێک لە جۆرەکانی ڕستە نمونەیەک بهێنەوە و نیشانەکانیان بۆ دابنێ.

## ڕاهێنان (٢)

ئەم ڕستانەی خوارەوە بۆ چ مەبەستەک بەکارهاتوون:

١. بە برایەتی سەر دەکەوین.

٢. ئەم پێنووسە جوانە هی کێیە؟

٣. ئێرە چەند شوێنێکی خۆشە!

٤. هەستە لە خەو ئەی لاوی کورد.

## ڕاهێنان (٣)

ئەم ڕستە پرسانە بکە بە ڕستەی ڕاگەیاندن:

١. کەی پەرلەمانی کوردستان دامەزرا؟

٢. کەی کۆماری کوردستان دامەزرا؟

٣. ساڵ چەند مانگە؟

٤. بۆچی لە قوتابخانە دواکەوتیت؟

٥. ڕۆژێ چەند جار ددانی خۆت دەشۆیت ؟

## ڕاهێنان (٤)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە، بە یەکێک لەم وشانە تەواو بکە:
(ئایا، کوێ، کەی، چۆن، چ)

١. ........... دیجلە بە هاوین هەڵدەستێت؟
٢. هەنگ لە ........... دەژی؟
٣. ........... شەڕی یەکەمی جیهان هەڵگیرسا؟
٤. بارام لە ........... کێلگەیەک کار دەکات؟
٥. ........... گەنم دەچێنرێت؟

## ڕاهێنان (٥)

ئـ. بەیانی بۆ هەکاری دەچم. (کەی)
ب. کەی بۆ هەکاری دەچیت؟
تۆش ئەم ڕستانەی خوارەوە بە وشەی ناو کەوانەکان وەک نموونەی سەرەوە (ب) لێبکە:

١. ترێ لە بازاڕ دەفرۆشرێت. (کوێ)
٢. تووتن بە دێراو دەچینرێت. (چۆن)
٣. بەهاران گژوگیا دەردەکەوێت. (چی)
٤. هیوا بە کوردی دەدوێت. (کێ)
٥. ئەمە بفرۆشم باشترە. (کامە)

## ڕاهێنان (٦)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. کێ سەرکردەی شۆڕشی ئاگریداغ بوو؟

٢. گەڕۆی کوێ بەناوبانگە؟

٣. کوردستان بەسەر چەند وڵات دابەشکراوە؟

٤. کێ سرودی (ئەی ڕەقیب)ی داناوە؟

٥. ناوی پایتەختی هەرێمی کوردستان چییە؟

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| سەرسوڕمان | : | مەندەهۆش، حەپەسان |
| پێویست | : | پێدڤی |
| تێپەڕی | : | دەربازبوو |
| مانگ | : | هەیڤ |
| دامەزرا | : | هاتەدانان، دانرا |
| کەی | : | کەنگی |
| هەڵدەستێت | : | ڕادەبێت |

# ڕستە

کۆمەڵەی ناو- کۆمەڵەی کار

نیهاد گوزارە

١. پەڕتوکەکەی پەریزاد نوێیە.
٢. کورد خۆڕاگرە.
٣. ئەو زیرەکە.
٤. مەلای جزیری بلیمەت بوو.
٥. چیای هەڵگورد بڵندە.

## ڕاڤە:

ڕستە کۆمەڵە وشەیەکە بەسەر یەکەوە دێن، مەبەست و واتایەکی تەواو دەبەخشێت، لە دوو بەش پێکدێت:

١. بەشی ناو
٢. بەشی کار

١. کۆمەڵەی ناو: ئەو بەشەیە، کە لە ڕستەدا لێی دەدوێین و ڕاگەیاندنێکی لەبارەیەوە دەدەین وەک: پەڕتوکەکەی پەریزاد، کورد، ئەو، مەلای جەزیری، چیای هەڵگورد.

٢. کۆمەڵەی کار: ئەو بەشەیە، کە لە ڕستەدا ڕاگەیاندنێک لە بارەی کۆمەڵەی ناوەوە دەدات، وەک: نوێیە، خۆڕاگرە، زیرەکە ، بلیمەت بوو، بڵندە.

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی ســەرەوە دەبینین وشەکانی (پەڕتووکەکە، کورد، هاژە، مەلای جزیری، هەڵگورد) ناون، وەسف کراون و هیچ کارێکیان ئەنجام نەداوە بۆیە پێیان دەگوترێت نیهاد.
دیسان هەر لە هەمان ڕستەکانی سەرەوەدا:
وشەکان (نوێی، خۆڕاگر، زیرەک، بلیمەت، بڵند) هاوەڵناون بەهاوکاری کاری ناتەواو وەسفی ناوەکانی پێش خۆیان دەکەن.

## پێناسە:

١. نیهاد: وشەیەکی بنچینەییە لە ڕستەدا (ناو یان جێناو)ێکە سیفەتێك یان هەواڵێکی دەدرێتە پاڵ و کاری ڕستەکە کارێکی ناتەواوە.

٢. گوزارە: بریتییە لە کاری ناتەواو بەیارمەتی وشەیەکی دیکە سیفەتێک یان هەواڵێک دەداتە پاڵ نیهاد.

هەرچی کار هەیە لە زمانی کوردی کاری تەواوە تەنها (ە، بوو، دەبێت) کە لە چاوگی (بوون) وەردەگیرێن ناتەواون.

## ڕاهێنان (١)

ئەم کارە ناتەواوانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:
( ە، دەبێت، بوو )

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە نیهادێکی ناوی پڕ بکەوە:

١. .......... هۆزانڤانەکی کورد بوو.

٢. .......... هی ئەوە.

٣. .......... سلێمانی بەناوبانگە.

٤. .......... هەولێر دێرینە.

٥. .......... کوڕێکی زیرەکە.

## ڕاهێنان (٣)

ئەم بۆشاییانە بە کارێکی ناتەواو پڕ بکەوە:

١. شەرەفخانی بدلیسی مێژوونووسێکی کورد ........

٢. ئاسۆ خوێندکارێکی زیرەک ............

٣. باوکم مامۆستا ...............

٤. سەیران ............ بە ئەندازیار.

# ڕستە

کۆمەڵەی ناو — کۆمەڵەی کار

بکەر کار

١. دلێر دەخوێنێت.

٢. شلێر نامە دەنووسێت.

٣. مامۆستا چوو بۆ قوتابخانە.

٤. ئێوە هاتن.

٥. باپیر خلیسکا.

## ڕاڤـە:

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی سەرەوە دەبینین وشەکانی (دلێر، شلێر، مامۆستا، ئێوە، باپیر)، ناون هەریەکەیان کارێکیان ئەنجامداوە، بۆیە بەم وشانە دەگوترێت بکەر.

دیسان هەر لە ڕستەکانی سەرەوەدا وشەکانی (دەخوێنێت، دەنووسێت، چوو، هاتن، خلیسکا)، هەواڵدەرن و ئەنجامی کارێک دەدەنە پاڵ کەسێک لە دەمێکی دیاریکراودا، بەم وشانەش دەگوترێت (کار).

## پێناسە

١. بکەر: وشەیەکی بنچینەییە کە (ناو یان جێناو)ە لە ڕستەدا کارێک ئەنجام دەدات.

٢. کار: وشەیەکی بنچینەییە لە ڕستەدا، کە کردەوەیەک دەداتە پاڵ کەسێک یان شتێک لە دەمێکی دیاریکراودا.

## ڕاهێنان (١)

لەم ڕستانەی خوارەوە بکەر دەربهێنە:

١. مەلەوانەکە لە ڕووبارەکە پەڕییەوە.

٢. ئازاد لە سلێمانی دەژی.

٣. هاژە بۆ خانەقین دەچێت.

٤. پیرۆت زەوییەکەی کێڵا.

٥. دانا هاریکاری باوکی دەکات.

٦. ڕەنجبەر کار دەکات.

## ڕاهێنان (٢)

لەم ڕستانەی خوارەوە کار دەربهێنە:

١. ئافرەتەکە دەسکە گوڵێکی کڕی.

٢. پۆلیسەکە دزەکەی گرت.

٣. ئاسنگەر داس دروست دەکات.

٤. تاڤگە وانەکانی دەخوێنێت.

٥. من ڕێزانم دیت.

٦. نانەوا هەویر دەشێلێت.

## ڕاهێنان (٣)

لەم ڕستانەدا (بکەر) و (کار) دەربهێنە:

١. خوناڤ لە ئەزموون دەرچوو.

٢. خانزاد نیگار دەکێشێت.

٣. من حەز لە سەربەستی دەکەم.

٤. نازە سرود لەبەردەکات.

٥. ژیان کراسێکی کڕی.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
| --- | --- |
| بنچینە | بناغە، بنیات، بنج |
| خوناڤ | خوناو |
| دهێت | دێت |

# تەواوکەر

١. گەڵای دارەکە وەری.
٢. شووشەی پەنجەرەکە شکا.
٣. منداڵی زیرەک سەردەکەوێت.
٤. ماسی لە ئاودا دەژی.
٥. گوێزی هەورامان بە دەست دەشکێت.

## ڕاقــــــــە:

لە وانەکانی پێشتردا ئەوەمان ڕوونکردەوە، کە ڕستە لەسەر دوو بنچینەی سەرەکی پێکدێت کە (بکەر، کار)ن.

- لە ڕستەی یەکەمدا (گەڵا) بکەرە و (وەری) کارە.
- لە ڕستەی دووەمدا (شووشە) بکەرە و (شکا) کارە.
- لە ڕستەی سێیەمدا ( منداڵی ) بکەرە و (سەردەکەوێت) کارە.
- لە ڕستەی چوارەمدا (ماسی) بکەرە و (دەژی) کارە.
- لە ڕستەی پێنجەمدا (گوێز) بکەرە و (دەشکێت) کارە.

ڕەنگە بپرسن، ئەی وشەکانی دیکەی ناو ڕستەکە چین؟ وە بۆچی بەکارهاتوون؟

لە وەڵامدا دەڵێین: جگە لە دوو وشە بنچینەییەکە، کە (بکەر، کار)ن وشەکانی دیکە پێیان دەگوترێت تەواوکەر.

* له ڕستەی یەکەمدا (دارەکە) تەواوکەری بکەری (گەڵا) یە.
* له ڕستەی دووەمدا (پەنجەرەکە) تەواوکەری بکەری (شووشە)یە.
* له ڕستەی سێیەمدا (زیرەک) تەواوکەری ناوی (منداڵ)ە.
* له ڕستەی چوارەمدا (له ئاودا) تەواوکەری کاری (دەژی)یە.
* له ڕستەی پێنجەمدا (هەورامان) تەواوکەری بکەری (گوێز)ە (بە دەست) تەواوکەری کاری(دەشکێت)ە.

کەواتە، ڕستە لەسەر دوو بنچینەی سەرەکی دادەمەزرێت کە (بکەر، کار)ن و هەرچی لەو دوو وشەیە زیاتر بوو دەبێتە تەواوکەر، کە بۆ تەواوکردن و دیاریکردنی واتاکانیانە.

**پێناسە: تەواوکەر:** هەموو ئەو وشانەی کە لە ڕستەدا هەن جگە لە (بکەر و نیهاد) لە کۆمەڵەی ناودا ،( کار) لە کۆمەڵەی کاردا هەروەها ئامرازەکان، تەواوکەریان پێ دەگوترێت.

## ڕاهێنان (١)

لەم ڕستانەدا تەواوکەری بکەر دیاریبکە:

١. دایکی گوڵچین هاتەوە.
٢. کوڕی ئازاد بە یەکەم دەرچوو.
٣. گۆشتی بەرخ زوو دەکوڵێت.
٤. لەشکرەکەی زەینەفۆن(١) بە کوردستاندا تێپەڕی.

(١) زەینەفۆن : سەرلەشکرێکی یۆنانی بوو.

## ڕاهێنان (٢)

لەم ڕستانەدا تەواوکەری کار دیاریبکە:

١. چرۆ بۆ قوتابخانە دەچێت.

٢. دلێر بۆ مێرگەسوور چوو.

٣. ڕۆن لە زەیتوونی گەییو دەگیرێت.

٤. هەرمێییەکە لەناو سەبەتەکەدا ڕزی.

## ڕاهێنان (٣)

تەواوکەرێکی گونجاو بۆ ئەم بۆشاییانە، دابنێ:

١. من مێژووی ............ دەخوێنم.

٢. نێرگز ............ دەڕوێت.

٣. وانەی............ نووسییەوە.

٤. فرۆکەکە ............ فڕی.

# کـــــار

١. هێمن چیرۆکی نووسی.
٢. شیرین گۆڤار دەخوێنێتەوە.
٣. مرۆڤی زیرەک سەردەکەوێت.
٤. کۆترەکە هەڵفڕی.
٥. ئاسک گیا دەخوات.
٦. من بەیانی بۆ زانکۆ دەچم.

## ڕاڤــــــە:

لە زمانی کوردیدا ڕستە بەبێ کار نابێت، لەم ڕستانەی سەرەوەدا وشەی (نووسی، دەخوێنێتەوە، سەردەکەوێت، هەڵفڕی، دەخوات، دەچم) کارن، ڕووداني کارێک پێشان دەدەن، لە تافێکی دیاریکراودا، لەلایەن کەسێک یان شتێک جێبەجێ دەکرێت.

-لە ڕستەی یەکەمدا کاری (نووسی) لە دەمکاتی ڕابردوودا دراوەتە پاڵ بکەر (هێمن).

-لە ڕستەی دووەمدا کاری (دەخوێنێتەوە) لە کاتی ڕانەبردوودا، دراوەتە پاڵ بکەر (شیرین).

-لە ڕستەی سێیەمدا کاری (سەردەکەوێت) لە کاتی ڕانەبردوودا، دراوەتە پاڵ بکەر (مرۆڤ).

- له ڕستەی چوارەمدا کاری (هەڵفڕی) له دەمکاتی ڕابردوودا، دراوەته پاڵ بکەر (کۆترەکه).
- له ڕستەی پێنجەمدا کاری (دەخوات) له دەمکاتی ڕانەبردوودا، دراوەته پاڵ بکەر (ئاسک).
- له ڕستەی شەشەمدا کاری (دەچم) له دەمکاتی داهاتوودا، دراوەته پاڵ بکەر (من).

## پێناسە:

**کار**: ئەو وشەیەیە، که کردەوەیەک دەداته پاڵ کەسێک یاشتێک له دەمێکی دیاری کراودا.

کار/ له ڕووی کاتەوه دەبێته دوو جۆر:

ئـ- ڕابردوو

ب- ڕانەبردوو

## ڕاهێنان (١)

شەش ڕسته بهێنه، پاشان کارەکانیان دەست نیشان بکه.

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە کارێک پڕ بکەوە:

١. لە کوردستان بەفر ...........

٢. شەش نەمامم لە باخەکەدا ............

٣. کیلۆیەک ترێم ............

٤. پەری ............

٥. شێخ مەحموود لە سلێمانی ............

٦. کتێبی ڕێزمان ............

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| ئاسک | : | مامز |
| بەیانی | : | سبەی ، سپێدە |
| نەمام | : | شەتڵ |

# دەمەکانی کار

ئـ- کاری ڕابردوو

١. هیوا وانەکەی خوێند.
٢. هیوا وانەکەی خوێندووە.
٣. هیوا وانەکەی خوێندبوو.
٤. هیوا وانەکەی دەخوێند.

## ڕاڤـــــــــــــە:

ئەگەر بە وردی سەرنج لە ڕستەکانی سەرەوە بدەین، دەبینین: وشەکانی (خوێند، خوێندووە، خوێندبوو، دەخوێند) هەموویان لە ڕستەکاندا وشەی بنچینەیین، کارێک پیشاندەدەن، کە لەپێش ئاخاوتندا بکەرێک ئەنجامیداون، لەبەر ئەوە پێیان دەگوترێت، کاری ڕابردوو:

کاری ڕابردووی (خوێند) کارێکی ڕابردووی نزیکە، هیچ پێشگرو پاشگرێکی وەرنەگرتووە و کارەکانی دیکەش لە کاری (خوێند)ەوە وەرگیراون بەم جۆرەی خوارەوە:

-(خوێند)کاری ڕابردووی تەواوە لە کاری خوێند + پاشگری (ووە) پێکهاتووە

-(خوێندبوو) کاری ڕابردووی دوورە لە کاری خوێند + پاشگری (بوو) پێکهاتووە.

- (دەخوێند) کاری ڕابردووی بەردەوامە لە پێشگری (دە) + کاری خوێند پێکهاتووە.

## پێناسە

**کاری ڕابردوو:** کارێکە لەپێش ئاخاوتن ڕوویداوە و چوار جۆر کاری ڕابردوو هەیە، وەک لەم خشتەیەی خوارەوە هاتووە:-

| کاری ڕابردوو | جۆرەکانی | پێکهاتنی | | |
|---|---|---|---|---|
| خوێند | ڕابردووی نزیک | ـــ | خوێند | ـــ |
| خوێندووە | ڕابردووی تەواو | ـــ | خوێند | ووە (١) |
| خوێندبوو | ڕابردووی دوور | ـــ | خوێند | بوو |
| دەخوێند | ڕابردووی بەردەوام | دە | خوێند | ـــ |

## ڕاهێنان (١)

لەم ڕستانەدا کاری ڕابردوو دیاریبکەو جۆرەکانی بنووسە:

١. پەرژینەکە سووتا.

٢. شارە گەورەکانی هەرێمی کوردستانم بینیوە.

٣. کە من چووم، ئەو ڕۆشتبوو.

٤. ڕێباز لە گۆڕەپانەکەدا یاری دەکرد.

٥. منداڵەکە پێی گرتووە.

(١) ئەگەر کارەکە کۆتایی بە پیتی بزوێن هاتبوو ئەوا تەنیا (وە) وەردەگرێت وەکو (سووتا-سووتاوە)، (باری - باریوە)

## ڕاهێنان (٢)

ئـ - فڕی.

ب- فڕیوە، فڕیبوو، دەفڕی.

تۆش ئەم کارە ڕابردووانە وەک نموونەی (ب) لێبکە:

(برد، شێوا، چوو، هاڕی، هەڵخست)

## ڕاهێنان (٣)

ئەم کارە ڕابردووانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

( چاندووە، شێلا، سەرکەوتووە، نووستبوو )

## ڕاهێنان (٤)

بکەروکاروتەواوکەر لەم ڕستانەدا دیاربکە:

١. تۆ لەسەر کانییەکە دانیشتبوویت.

٢. باران بە لێزمە دەباری.

٣. ئاسکۆڵ کراسەکەی دووریوە.

٤. باخەوانەکە گوڵەکانی ئاودا.

## ڕاهێنان (٥)

ئـ- نـــووسی نووسیوە نووسیبوو دەنووسی

ب- نەنووسی نەنووسیوە نەنووسیبوو نەدەنووسی

تۆش ئەم کارە ڕابردووانە وەک نموونەی (ب) بکە بە نەرێ (١):

(کەوت، هەڵگرت، باری)

(١) نەرێکردن، مەبەست نەرێکردنی کارە بە ئامرازی (نە). ئەگەر کارەکە ڕابردوو بوو، ئامرازی (نە) دەیکات بە نەرێ وەک نەکڕیوە، نەچووە، نەیخواردووە، نەبووە.

# دەمەکانی کار

## ب- کاری ڕانەبردوو

١. ئەرکەکانم دەنووسم.
٢. وانەکانم دەخوێنم.
٣. نانەکە دەخۆم.
٤. پەڕتوکەکە دەکڕم.

## ڕاڤـــــــــــە:

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم ڕستانەی سەرەوە دەبینن، وشەکانی (دەنووسم، دەخوێنم، دەخۆم، دەکڕم) لەکاتی ئاخاوتن یان لەدوای ئاخافتن ڕوودەدەن لەبەر ئەوە پێیان دەوترێت کاری ڕانەبردوو.

## پێناسە:کاری ڕانەبردوو

١. کارێکە لەکاتی ئاخافتن یان دوای ئاخافتن ڕوودەدات.
٢. بە نیشانەی (دە) دەست پێدەکات.

## ڕاهێنان (١)

کاره ڕانەبردووەکانی ئەم ڕستانە دیاربکە:

١. وا بۆ سەیران دەچم.

٢. دار بەڕوو لە کوردستان دەڕوێت.

٣. ئێمە پەیڕەوی یاسا دەکەین.

٤. نەوت لە شیواشۆک دەردەهێنرێت.

٥. پزیشک چارەسەری نەخۆش دەکات.

## ڕاهێنان (٢)

ئەم کاره ڕانەبردووانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

(دەسڕێت، دەنووسن، دەتەکێنێت، دەشێلێت، دەشوات)

## ڕاهێنان (٣)

ئەم کاره ڕانەبردووانە بگۆڕە بۆ کاری ڕابردووی نزیک:

(دەخوات، دەنووسێت، لەبەر دەکات، هەڵدەخلیسکێت، دەماڵێت)

## ڕاهێنان (٤)

ئـ- دەچم.

ب- ناچم(١).

کاری (دەچم) کاری ئەرێیە، کاری (ناچم) کاری نەرێیە، تۆش ئەم کارە ئەرێیانەی خوارەوە بگۆڕە و بیانکە بە کاری نەرێ.

(دەچێنێت، پێشدەکەوێت، دەردەچین، دئاخفێت، دەسووتێت)

## ڕاهێنان (٥)

کارەکانی ئەم پارچە نووسینە دیاربکە:

خەڵکی گوندەکان بە زستان لەبەر خۆرەکەدا دادەنیشن و لە کاروباری خۆیان دەدوێن، لەمەولا بە کەرەسەی نوێ زەوی دەکێڵن، ئاوی دەدەن، پەینی پێوە دەکەن و دروێنەی دەکەن، لە دەست چەوساندنەوە ڕزگاریان دەبێت، حکومەتی هەرێم دەستیان دەگرێت، تا ژیانیان خۆشتربێت.

(١) کاری ڕانەبردوو بە ئامرازی (نا) دەکرێت بە نەرێ، وەک: ناخوات، ناڕوات.

# کاری داخوازی

١. کوردینە بخوێنن.
٢. سێوی باش بکڕە.
٣. وانەکان بنووسەوە.
٤. تۆ دەموچاوت جوان بشۆ.
٥. قوتابخانەکەت بپارێزە.
٦. یاری بەئاگر مەکە.

## ڕاڤـــــــە:

ئ ـ لە ڕستەی یەکەمدا وشەی (بخوێنن) کارێکە، داوای جێبەجێکردنی خوێندنی پێدەکرێت، لەپاش ئاخاوتن، کەواتە کارەکە پاش ئاخاوتن جێبەجێدەکرێت.

ب ـ لە ڕستەی دووەمدا وشەی (بکڕە) کارێکە، لەپاش ئاخاوتن داخوازی کڕینی پێدەکرێت.

پ ـ لە ڕستەی سێیەمدا وشەی (بنووسەوە) کارێکە لە پاش ئاخاوتن داخوازی نووسینەوەی پێدەکرێت.

ت ـ لە ڕستەکانی (چوارەم وپێنجەم)دا کارەکانی (بشۆ، بپارێزە) کاری داخوازین، چونکە داوای ئەنجامدانی کارێکیان پاش ئاخاوتن پێدەکرێت.

# پێناسە

کاری داخوازی :- کارێکە داوا لە کەسی دووەمی (تاک، کۆ) یان گیانلەبەرێک دەکرێت، بۆ ئەنجامدانی یان ئەنجامنەدانی کارەکە.

## ڕاهێنان (١)

کارە داخوازییەکانی ئەم ڕستانە دیاربکە:

١. دڵسۆز وەرە، دابنیشە.

٢. ئێوە یارمەتی هەژاران بدەن.

٣. جوتیارینە زەوی بکێڵن و بیکەنە گەنم.

٤. لاوان جەژنی نەورۆز جلکی جوان لەبەربکەن.

٥. تۆ بڕۆ، وانەکەت بنووسە، ئینجا بنوو.

## ڕاهێنان (٢)

کارێکی داخوازی گونجاو لەم بۆشاییانەدا دابنێ:

١. بەیانییان وەرزش............

٢. شیرەکە ........... بە منداڵەکە.

٣. جلەکان بە ئاوی پاک ............

٤. ئاهەنگێک .......... بۆ یادی بێکەس.

## ڕاهێنان (٣)

ئـ- بکڕە.

ب-مەکڕە (١).

تۆش ئەم کارە داخوازییانە وەک نموونەی (ب) بکە بە کاری نەرێ:
(بفرۆشن، بخۆ، دابەزە، بچن، ببێژە، هەڵبخە، بانگبکەن).

## ڕاهێنان (٤)

- ڕاوەستا
- ڕادەوەستێت
- ڕابوەستە

ئەم کارە ڕابردووانە بگۆڕە و بیانکە بە کاری ڕانەبردوو و داخوازی:
(داخست، شکاند، نووست، هەڵپاچی، چاند)

(١) کاری داخوازی بە ئامرازی (مە) دەکرێت بە نەرێ، وەک: مەڕۆ، مەچۆ.

# کــــار

## کاری تێنەپەڕ - کاری تێپەڕ

- ئـ -

١. فەرهاد هات.
٢. ئەمامەکە ڕوا.

- ب -

١. بازرگان کوتاڵ دەفرۆشێت.
٢. دلۆڤان نان دەخوات.

## ڕاڤە :

١. ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی بەشی ( ئـ ) دەبینین هەر ڕستەیەکیان لە بکەر و کار پێکهاتووە. کارەکە بە تەنیا واتای ڕستەکە تەواو دەکات، بەبێ ئەوەی ئەرکەکەی لە بکەرەکەوە تێبپەڕێتە سەر کەسێک یان شتێکی دیکە، لەبەرئەوە پێی دەگوترێت ( کاری تێنەپەڕ ) وەکو ( هات، ڕوا ).

٢. ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی بەشی ( ب ) دەبینین هەر ڕستەیەکیان لە بکەر و بەرکار و کار پێکهاتووە، بەڵام کارەکانی ( دەفرۆشێت ) و ( دەخوات ) نەیانتوانیوە بە تەنیا واتای ڕستەکانی تەواوبکەن و مەبەستی ڕستەکانیش بدەن بە دەستەوە، بەڵکو پێویستییان بە وشەی دیکە هەیە، وەکو وشەی ( کوتاڵ ) لە ڕستەی یەکەمداو وشەی ( نان ) لە ڕستەی دووەمدا کە پێیان دەگوترێت ( بەرکار ) بۆیە بەم کارانە دەگوترێت ( کاری تێپەڕ )

بۆ زانیاری زیاتر تەماشای ئەم خشتەیە بکە :

| کاری تێنەپەڕ | | |
|---|---|---|
| بکەر | بەرکار | کار |
| فەرهاد | - | هات |
| نەمامەکە | - | ڕوا |

| کاری تێپەڕ | | |
|---|---|---|
| بکەر | بەرکار | کار |
| بازرگان | کوتاڵ | دەفرۆشرێت |
| دلۆڤان | نان | دەخوات |

## پێناسە :

١ . کاری تێنەپەڕ : ئەو کارەیە، کە لە ڕستەدا پێویستی بە بکەر هەیە و پێویستی بە بەرکار نییە بۆ تەواوکردنی واتای ڕستەکە.

٢ . کاری تێپەڕ : ئەو کارەیە، کە لە ڕستەدا پێویستی بە بکەر و بەرکار هەیە بۆ تەواوکردنی واتای ڕستەکە.

## ڕاهێنانی ( ١ )

لەم ڕستانەدا کاری تێنەپەڕ و کاری تێپەڕ دەربهێنە :

١. شێرەکە هەڵچوو.
٢. کورد دوژمنی بەزاند.
٣. مریشک هێلکە دەکات.
٤. ڕزگار دانیشت.
٥. سۆما پێدەکەنێت.

## ڕاهێنانی ( ٢ )

ئەم بۆشاییانە بەم کارە تێنەپەڕانە تەواو بکە :

( ڕووخا، هات، دانیشت، ڕژا )

١. دۆیەکە ............
٢. خانووەکە ............
٣. بەهار ............
٤. پڕشنگ ..............

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بەم کارە تێپەڕانە تەواو بکە :
( دیت، دەکات، دەخوێنێتەوە، دەپارێزێت، دەچێنین )

١. شارا وەرزش ............
٢. من ئازادم ..............
٣. ئێمە گوڵ ..............
٤. کاوە ڕۆژنامە ................
٥. پێشمەرگە نیشتمان .................

## ڕاهێنانی (٤)

ئـ- شکا
ب- شکاند

ئەم کارانەی خوارەوە، وەک وێنەی (ب) لێبکە:

( سووتا، کوڵا، خوسا، ڕژا، شێوا )

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| کوتاڵ | : | قوماش، پەڕۆک |
| دانیشت | : | ڕونیشت |
| تێنەپەڕ | : | نەدەرباز |
| تێپەڕ | : | دەرباز |



# جێناو

## یەکەم: جێناوی کەسی سەربەخۆ

١. من هەوای پاک هەڵدەمژم.
٢. ئێمە لەلادێ دەژین.
٣. تۆ گوڵت ڕواند؟
٤. ئێوە کێڵگەکەتان بژارکرد؟
٥. ئەو هەویرەکەی شێلاوە.
٦. ئەوان لە دوژمن ڕزگاریان بوو.

ساڵی ڕابردوو ئەوەمان خوێند کە جێناو، ئەو وشەیەیە، کە لە بری ناوێک بەکاردەهێنرێت، ئیتر ناوەکە تاک بێت یا کۆ.

ئەگەر سەرنجی ڕستەکانی سەرەوە بدەین:

- وشەی (من) لە ڕستەی (من هەوای پاک هەڵدەمژم)، سەربەخۆ دەبێژرێت، لەجێی ئەو کەسە بەکارهێنراوە، کە دەدوێت. وشەی (ئێمە) لە ڕستەی ( ئێمە لە لادێ دەژین)، سەربەخۆ دەبێژرێت لە جێی ئەو کەسانە بەکارهێنراوە کە دەدوێن.
- وشەی (تۆ) لە ڕستەی (تۆ گوڵت ڕواند) سەربەخۆ دەبێژرێت، و لە جێی ئەو کەسە بەکارهێنراوە کە دەدوێنرێت.
- وشەی (ئێوە) لە ڕستەی (ئێوە کێڵگەکەتان بژارکرد) سەربەخۆ دەبێژرێت، لەجێی ئەو کەسانە بەکارهێنراوە کە دەدوێنرێن.
- وشەی (ئەو) لە ڕستەی (ئەو هەویرەکەی شێلاوە) سەربەخۆ دەبێژرێت و لەبری ئەو کەسە بەکارهێنراو کە لێیدەدوێین.
- وشەی (ئەوان) لە ڕستەی (ئەوان لە دوژمن ڕزگاریان بوو) سەربەخۆ دەگوترێت و لە جیاتی ئەو کەسانە بەکارهێنراوە، کە لێیان دەدوێین.

## پێناسە

١. جێناوی کەسی لە بری ناوێک بەکاردێت، جا ناوەکە تاک بێت یان کۆ.

٢. جێناوی کەسی دەکرێت بە دوو جۆر:

ئـ- جێناوی کەسی سەربەخۆ:- ئەو وشەیە لە بری ناوێک یان شتێک بەکار دێت جا ناوەکە تاک بێت یان کۆ.

| کەس | تاک | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | من | ئێمە |
| دووەم | تۆ | ئێوە |
| سێیەم | ئەو | ئەوان |

ب- جێناوی کەسی لکاو.

## ڕاهێنان (١)

جێناوی کەسی سەربەخۆ لەم ڕستانەدا دیاربکە:

١. ئەو باوەشێنی خۆی دەکات.

٢. پاسەوانەکە تۆی بانگکرد.

٣. باوکی ئێوە لە کارگەی جگەرە کار دەکات.

٤. من تەفرە نادرێم.

٥. ئەو بۆ ماڵی ئێمە هات.

## ڕاهێنان (٢)

جێناوێکی سەربەخۆ بۆ ئەم بۆشاییانە دابنێ:

١. .......... دڵسۆزی ئەم خاکەین.

٢. کاکم نەمامەکەی بۆ .......... ناشت.

٣. .......... بەشداری خولی کۆمپیوتەر دەکەن.

٤. شیلان پێنووسەکە لە .......... وەردەگرێت.

٥. .......... کۆترەکەم هەڵفڕاند.

## ڕاهێنان (٣)

ئەم جێناوانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

(ئەوان، من، ئێوە، تۆ، ئێمە، ئەو)

پەندی پێشینان :-

ئیشی بە وەختـــی

پاشای سەر تەختی

# دووەم: جێناوی کەسی لکاو

## کۆمەڵەی (١)

جێناوی کەسیی لکاو ئەو جێناوانەن، کە بەدوای وشەی دیکەوە دەلکێن (دەنووسێن)، جێناوی لکاو دوو کۆمەڵەیە، لە بابەتی ئەمڕۆماندا کۆمەڵی (١) ڕوون دەکەینەوە:

١. هەنجیرەکەم خوارد.
٢. پرسیارمان لە مامۆستا کرد.
٣. نەخشەکەت هەڵگرت.
٤. ڕۆژنامەتان خوێندەوە.
٥. تۆپەکەی بە دەست گرتەوە.
٦. پۆلەکەیان خاوێن کردەوە.

# ڕاڤە

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی سەرەوە دەبینین:

- بێژەی (م) لە ڕستەی (هەنجیرەکەم خوارد)، لە جێی کەسێک بەکارهاتووە، کە دەدوێت، بەڵام لەبەر ئەوەی لە پاڵ وشەیەکی دیکە دایە، سەربەخۆ (ناگوترێت)،لەبەر ئەوە پێیدەگوترێت، جێناوی لکاوی کەسی یەکەمی تاک.

- بێژەی (مان) لە ڕستەی (پرسیارمان لە مامۆستا کرد)دا لە جێی کەسانێک بەکارهاتووە، کە دەدوێن، بەڵام لەبەرئەوەی لەگەڵ وشەیەکی دیکەدا نەبێت، سەربەخۆ نابێژرێت، پێیدەگوترێت جێناوی لکاوی کەسی یەکەمی کۆ.

- بێژەی (ت) لە ڕستەی (نەخشەکەت هەڵگرت)، لە جێی ئەو کەسە بەکارهێنراوە کە دەدوێنرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی لە پاڵ وشەیەکی دیکەدا نەبێت، سەربەخۆ نابێژرێت، لەبەرئەوە پێیدەگوترێت جێناوی لکاوی کەسی دووەمی تاک.

- بێژەی (تان) لە ڕستەی (ڕۆژنامەتان خوێندەوە)، لەبری ئەو کەسانە بەکارهێنراون، کە دەدوێندرێن، بەڵام لەبەر ئەوەی سەربەخۆ نابێژرێت دەخرێتە تەک وشەیەکی دیکەوە پێیدەگوترێت جێناوی لکاوی کەسی دووەمی کۆ.

- بێژەی (ی) لە ڕستەی (تۆپەکەی بەدەست گرتەوە)دا، لە جێی ئەو کەسە بەکارهێنراوە کە لێیدەدوێین، بەڵام لەبەر ئەوەی سەربەخۆ نابێژرێت، ئەگەر لەگەڵ وشەیەکی دیکەدا نەبێت، لەبەرئەوە پێیدەگوترێت: جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاک.

- بێژەی (یان) لە ڕستەی (پۆلەکەیان خاوێن کردەوە)، لەبری ئەو کەسانە بەکارهێنراون، کە لێیان دەدوێین، بەڵام لەبەرئەوەی سەربەخۆ نابێژرێت، دەخرێنە پاڵ وشەیەکی دیکەوە، پێیدەگوترێت جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی کۆ.

لە ئەنجامی ڕاڤەکە وردبوونەوە لە ڕستەکان دەگەینە ئەم خشتەیە کە ئەمانە جێناوی لکاوی کۆمەڵەی (١) یەکەمن:

| کەس | تاک | کۆ |
| --- | --- | --- |
| یەکەم | م | مان |
| دووەم | ت | تان |
| سێیەم | ی | یان |

## پێناسە:

**جێناوی لکاو:** ئەو جێناوەیە کە ناتوانرێت سەربەخۆ بگوترێت، ئەگەر نەخرێتە پاڵ وشەیەکی دیکە، لە جیاتی کەسی یەکەم و دووەم و سێیەمی تاک و کۆ بەکاردەهێنرێت، لە بری کەسێک، کە بدوێت، یا بدوێنرێت، یا لێی بدوێین (م، مان ـ ت، تان ـ ی، یان).

## ڕاهێنان (١)

جێناوی لکاو لەم ڕستانەدا دیاربکە، بۆ چ کەسێک بەکارهاتووە.

١. ئایا نانەکەت بۆ میوانەکە دانا؟
٢. نانەکەیان خوارد.
٣. پەڕتوکەکەم خوێندەوە.
٤. نامەکەی بە پۆستەدا نارد.

## ڕاهێنان (٢)

ئەم جێناوە لکاوانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

(ت، مان، ی، تان، یان، م)

## ڕاهێنان (٣)

ئـ- چاند

ب- چاندم - چاندت - چاندی

چاندمان - چاندتان - چاندیان

تۆش ئەم کارانەی خوارەوە وەک نمونەکانی (ب) لێبکە:

(خوارد، برد، خوێند، نووسی، گرت)

# جێناوی کەسی لکاو

## کۆمەڵەی (٢)

١. ئێوارە بۆ لای نەخۆشەکە ڕۆیشتم.
٢. نیوەڕۆ لەناو باخەکەدا دانیشتین.
٣. بۆ کوێ چوویت؟
٤. ئێوە کەی هاتن؟
٥. کۆترەکە فڕی.
٦. میوانەکان گەیشتن.

## ڕاقـــە:

ئەگەر سەرنج لە ڕستەکانی سەرەوە بدەین:
کۆمەڵێک جێناوی لکاوی دیکە بەکارهاتوون، کە لە زمانی کوردیدا بۆ کەسی یەکەم و دووەم و سێیەمی تاک و کۆ بەکاردەهێنرێن و جودان لەو جێناوەی کە لە وانەی پێشوودا لەژێر کۆمەڵەی (١) دا خوێندمان.
خشتەی جێناوە لکاوەکانی کۆمەڵەی (٢)

| کەس | تاک | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | م | ین |
| دووەم | یت | ن |
| سێیەم | ∅ (١) | ن |

(١) مامۆستای بەڕێز جێناوی لکاو لە کۆمەڵەی دووەم بۆ کەسی سێیەمی تاک لەگەڵ کاری ڕابردوو دەرناکەوێت.

## پێناسە:

# جیناوی کەسی لکاو

ئەو جێناوەیە کە ناتوانرێت سەربەخۆ بگوترێت، ئەگەر نەخرێتە پاڵ وشەیەکی دیکە، لە جیاتی کەسی یەکەم و دووەم و سێیەمی تاک و کۆ بەکار دەهێندرێت، لە بری کەسێک، کە بدوێت، یا بدوێنرێت، یا لێیبدوێین ( م ، ین ـ یت ، ن ـ ∅ ، ن )

## ڕاهێنان (١)

جێناوی لکاو لەم ڕستانەدا دیاربکە:

١. لەسەربان نووستین.
٢. بۆ سلێمانی دەچیت؟
٣. کۆمپیوتەرەکە دەکڕیت؟
٤. گۆڤارەکە دەخوێنمەوە.
٥. بۆ لای یارا دەچن.

## ڕاهێنان (٢)

ئـ ـ نووست بـ ـ نووستم ـ نووستیت ـ نووست
ـ نووستین ـ نووستن ـ نووستن
تۆش ئەم کارانە وەک نمونەکانی (ب) لێبکە:
(هات، کەوت، گەیشت، سووتا).

## ڕاهێنان (٣)

جێناوێکی کەسی لکاو بۆ بۆشاییەکانی کۆمەڵەی (١)، کۆمەڵەی (٢) دابنێ، بە مەرجێک بگونجێت لەگەڵ جێناوە سەربەخۆکەی بەرامبەری:

| جێناوی سەر بەخۆ | کۆمەڵەی ١ | کۆمەڵەی ٢ |
|---|---|---|
| من | م | م |
| ئێمە | — | — |
| تۆ | — | — |
| ئێوە | — | — |
| ئەو | — | — |
| ئەوان | — | — |

## ڕاهێنان (٤)

ئەم کارانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

(چاندی، دەڕۆیشت، هەڵگەڕام، دەبڕین، دەکرن)

## ڕاهێنان (٥)

ئەم جێناوە لکاوانە لە ڕستەدا بەکار بهێنە:

(م، ی، ن، یت، مان، یت)

# ڕاهێنانی گشتی

## ڕاهێنان (١)

لەم ڕستانەدا بکەرو کارو تەواوکەر دیاربکە:

١. ئازاد مۆبایل دەکرِیت؟

٢. ئەو بۆ سەیران دەچیت؟

٣. بەفر ناوچەکەی ئێمەی سپیکرد.

٤. من لە کارگەی جلوبەرگ کار دەکەم.

## ڕاهێنان (٢)

وشەیەکی گونجاو بۆ هەر یەکێک لەم بۆشاییانە دابنێ:

١. ........... بەرگری لە خاکی نیشتمان دەکات.

٢. جوتیارەکان ........... بەخێو دەکەن.

٣. ئێمە........... خۆش دەزانین.

٤. ئێمە نەوت لە ........... دەردەهێنین

٥. ........... نەخشەی خانووبەرە دەکێشن.

٦. پۆلیس پەیڕەوی یاسا ........... .

٧. توو لە ........... پێگەیشت.

## ڕاهێنان (٣)

کاری ڕابوردوو- ڕانەبوردوو- داخوازی، لەم ڕستانە دیاری بکە:

١. من زمانی کوردیتان فێردەکەم.

٢. تاوانبارەکان دەسگیرکران.

٣. پیرۆز دوو کتێبی کڕی.

٤. پارێزگاری پاکوخاوێنی پەڕتووکەکانت بکە.

٥. ئیبراهیم پاشا شاری سولێمانی دروستکرد.

## ڕاهێنان (٤)

لەم ڕستانە جێناوی سەربەخۆو کەسەکەی دیاری بکە:

١. ئێوە هیوای دوارۆژی گەلن.

٢. من بۆ ڕاوە ماسی چووم.

٣. ئەو بۆ کوێ دەڕوات؟

٤. ئێمە پێرێ خەرمانەکەمان هەڵگرت.

٥. تۆ پێنووسەکەت دا بەکێ؟

٦. ئەوان گەرمیان و کوێستان دەکەن.

## ڕاهێنان (٥)

ئەم وشانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

(لەژێر، ئێمە، هەڵواسی، بدۆشە، تان، پار، خاوێن، دەپرسێت)

## ڕاهێنان (٦)

ئەم پارچە پەخشانە بخوێنەرەوە، پاشان پێنج ڕستەی لێ دەربهێنە:
لە بەهاردا گژوگیا سەوز دەبێت، دارو درەخت گەڵا دەردەکەن، گیانلەبەر زۆر دەبێت، کانیاوەکان دەژیێنەوە، دەرودەشت کەسک و ڕەنگین دەبن، سەرما دەشکێت، کەسانێکی زۆر بۆ گەشت و گوزار دەچن، لە گشت لایەکەوە سەیران دەست پێدەکات.
کوڕان و کیژان بەرگی جوان لەبەر دەکەن، خۆراک لەگەڵ خۆیان دەبەن، ڕوودەکەنە دەشت، کانییەک یان ئاوێک یان جێنزارێکی خۆش هەڵدەبژێرن، لەوێ بە بەزم و خۆشی و سەما هەتا ئێوارە کات بەسەردەبەن.



# خۆشەویستی و تەبایی



خۆشەویستی جیهانێکە، فراوانە، پڕە لە ئـارەزوو و ئاواتی خۆشی ژیان، لە قووڵایی دڵ و دەروونی مرۆڤ پەیدا دەبێت، گەشە دەکات و لە پرشنگی چاوان دەردەکەوێت و دەکەوێتە پریشک هاویشتن. مرۆڤ لە ڕێی خۆشەویستییەوە ئاسۆی ژیانی لەبەرچاو فراوان دەبێت ئەستێرەی کامەرانی دەدرەوشێتەوە و دڵی بەهێز دەبێت و باوەڕی پتەو دەبێت هەر خۆشەویستییە، کە مرۆڤ دەکاتە مرۆڤێکی کارامە و خاوێن و خزمەتگوزار و هەمیشە لە دوودڵی و نائومێدی دووری دەخاتەوە. هەر کاتێک خۆشەویستی لەناو کۆمەڵدا بڵاوبووەوە، هەموو بەشادی و دڵخۆشی دەژین و دەبنە کانگەی هێزو توانا، وەکو شانەی هەنگ، وڵات پڕ دەبێت لە خۆشی ژیان، یارمەتی و کۆمەک بە یەکدیکردن، پنج دادەکوتێت، ڕێگەی پێشکەوتن ڕوناکتر دەبێتەوە و بە جارێک ئاسودەیی باوەش بە ژیاندا دەکات. ئەگەر خۆشەویستی خاک نەبێت، چۆن مرۆڤ گیانی لە پێناوی پاراستنیدا دەبەخشێت!

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| خزمەتگوزار | : | خزمەتکردن |
| دوودڵی | : | ڕاڕایی، دڵەڕاوکێ |
| نائومێد | : | بێ هیوا، بێ هێڤی |
| کانگە | : | سەرچاوە |
| پنج | : | ڕەگ |
| فراوان | : | بەرین، پان و پۆڕ |
| کۆمەک | : | یارمەتی، هاوکاری، ئالیکاری |
| ئاسودەیی | : | دڵنیایی |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. مرۆڤ کەی گیانی دەبەخشێتە خاکەکەی؟

٢. خۆشەویستی دایک بۆ منداڵەکانی، جۆرێکە لە خۆشەویستی، دەتۆش چەند جۆرێکی دیکە، دیاری بکە؟

٣. ئەگەرخۆشەویستی، لە ناو کۆمەڵگەیەک بڵاوبێتەوە، کۆمەڵگەیەکی چۆنە؟

## ڕاهێنان (٢)

وشەی دژواتا بەرامبەر بەم وشانە بنووسە:
(درێژی، شیرینی، خۆشەویستی، ئاسوودەیی)

## ڕاهێنان (٣)

بە وشەی گونجاو ئەم بۆشاییانەی خوارەوە پڕ بکەوە:
١. خۆشەویستی دڵێکەو ................
٢. ................ ئاسۆی ژیانی لەبەر چاو ڕوناک دەبێت.
٣. هەر کاتێ خۆشەویستی بڵاوبۆوە ................
٤ ئەگەر خۆشەویستی خاک نەبێت ................

## ڕاهێنان (٤)

بە خەتێکی جوان (دوو) جار ئەم دێڕە بنووسەوە:
[ هەموو باشێک جوانە، بەڵام مەرج نییە هەموو جوانێک باش بێت]

# ناسنامەی نەتەوە

که لێت بپرسن تۆ کێیت؟

دەتوانی ناسنامەکەت پیشان بدەیت، یا باسی خۆتیان بۆ بکەیت!

که نەتەوەش پرسیاری لێبکرێت داخۆ چییە؟

لەوەڵامدا: لەجیاتی ناسنامە، زانا و نووسەرو نیگارکێش و مۆسیقارو سیاسی و هونەرمەند کارمەندەکانی پیشاندەدات.

مرۆڤ دەبێت، لە سەرەتای گەنجییەوە وا تێبگات، بۆ ئەوە هاتۆتە دنیاوە ببێت بە نوێنەری گەلەکەی و بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرک و ڕۆڵەش پەروەردە بکرێت و پێبگەیەنرێت.

## ڕاهێنان

لە مامۆستاکەت داوابکە بنەماکانی نەتەوەت بۆ باسبکات.

### چالاکی

مامۆستای بەڕێز: ئەرکی مرۆڤ بەرامبەر خاک و نەتەوە چییە؟ بۆ خوێندکاران ڕوون بکەوە.

# بـــــــەیان



(الله و اكبر) مەلا بانگـدانـــــــــــە
تاریک و لێڵی بەری بەیانـــــــــــە

مانگی بەجێماو لە سەفەری شـــــەو
زەردە لە ترسی قاسپە قاسپی کـــــەو

ئەستێرەی مەغریب وەک قەترەی ئەمەل
کز کز ئەتکێتە ناو بەفری سەر کـــــەل

لە رێی ئەوبەری شاخ دەنگی زەنگ دێ
لە شوێنی ڕاوکەر تەقەی تفەنـــگ دێ

وا بە تەواوی دنیا ڕووناکــــــــــــە
هەر سیحری رووتە سروشت ئێستاکــە

لە درەخت ئەدا شنەی بای سەحـــەر
جموجووڵیەتی چەشنی سەودای سەر

لەسەر جۆگەی ئاش قازو مـــــــراوی
چاوەڕێی ڕۆژن هەڵبێنێ چـــــــاوی!

بەڵام تا خولْقی نەکا چێشتەنـــــگاو
نایەتە ناوی دێ پرشنگی هەتـــــاو!

**گۆران**

گۆران ناوی عەبدوڵلا کوری سلێمان بەگە، لە ساڵی ١٩٠٤ی زایینی لە شاری هەڵەبجە لەدایک بووە، یەکێک بوو لە شاعیرە نوێخوازەکانی کورد، ماوەیەک لە کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدا لە بەشی کوردی مامۆستا بووە، لە ١٩٦٢/١١/١٨ کۆچی دوایی کرد.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
| --- | --- | --- |
| قاسپە قاسپ | : | دەنگی خوێندنی کەو |
| ئەتکێتە | : | دلۆپ دلۆپ دەکەوێتە خوارەوە |
| درەخت | : | داروبار |
| شنە | : | کزەبا |
| جموجووڵ | : | جووڵە، لڤین |
| سەودای سەر | : | خەیاڵی ناو سەر |

## داڕشتن:

چەند دێرێک لەسەر زانست بنووسە.

پەندی پێشینان: -

دەوران دەوڵەتت لە دەست دەستێنی
بەڵام ناوی چاک تا سەر ئەمێنـــێ

# خەڵاتەکانی نۆبڵ



ئەلفرێد نۆبڵ، زانای سویدی لە ساڵی (١٨٣٢)ی زایینی لە وڵاتی سوید لە خێزانێکی هەژاروکەمدەرامەت لەدایک بووە، لە قوتابخانە نەیخوێندووە، بەڵکو لەسەر دەستی مامۆستای تایبەت لە ماڵی خۆی فێری خوێندەواری بووە، کە گەیشتە تەمەنی لاویی ڕوویکردە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ساڵێک لەوێ مایەوە وکە گەڕایەوە ئەوروپا، لەگەڵ باوکی پێکەوە دەستیان بە تاقیکردنەوە کرد لەسەر تەقەمەنییەکان و دەزگایەکی بچووکی بۆ بەرهەمهێنانی ماددەی (نیترۆگلیسرین). دروستکرد، ئەو ماددەیە زۆر بەخێرایی دەتەقێتەوە، لەبەر ئەوە نۆبل هەندێک ماددەی تایبەتی بەکارهێناو دینامێتی دروستکرد.

چەندین کارگەی بەرهەمهێنانی دینامێتی لە ئەوروپا دامەزراندو بەم ڕێگەیەوە سامانێکی زۆری بەدەستهێنا.

نۆبڵ، سەرەڕای زمانی سویدی چەند زمانێکی دیکەی دەزانی، زۆریش ناڕەحەت بوو، کە دینامێتی دروستکرد، لەبەر ئەوە پشتگیری لە ڕێکخراوەکانی ئاشتی کردووە، کە لە پێناوی ئاشتی لە ئەوروپا کاریاندەکرد.

لە ساڵی (١٨٩٦)ی زایینی کۆچی دوایی کرد.

سامانێکی زۆری لە پاش بەجێما، لە ڕاسپاردەکەیدا ڕایسپارد، کە قازانجی ئەو سامانەی بۆ پێنج خەڵات تەرخان بکرێت بۆ ئەو زانایانەی کە لە بوارەکانی پزیشکی و کیمیا و سروشت و ئەدەبی جیهانی و دۆستایەتی نێوان وڵاتان خزمەتی مرۆڤایەتییان کردووە.
ئێستاکەش هەموو ساڵێک لە شاری ستۆکهۆڵم لە ڕۆژی کۆچی دوایی ئەم زانایە بە پێی ڕاسپاردەی کۆمەڵێک زانای سویدی خەڵاتەکانی بواری زانست و ئەدەب بەسەر چەند زانایەکی شایستە دابەشدەکرێن، تەنیا خەڵاتی ئاشتی نەبێت، کە بە ڕاسپاردەی پێنج کەس کە پەرلەمانی نەرویج هەڵیان دەبژێرێت، چونکە لە سەردەمی نۆبل سوید و نەرویج یەک وڵات بووە، خەڵاتەکەش بریتییە لە میدالیایەکی زێڕین و بڕوانامەیەک و دوازدە هەزار جونەیهی ئەسترلینی.
یەکەم خەڵاتی نۆبل بۆ ئاشتی لە ساڵی (١٩٠١)ی زایینیی دراوە بە (جان هنری دونان) دامەزرێنەری دەستەی خاچی سوور.
چەند خۆش و چەند جێی سەربەرزییە بۆ ئێمەی کوردیش، ئەگەر ببیسین ڕۆژێک لە ڕۆژان زانایەکی کورد لە یەکێک لە بوارەکانی زانست خەڵاتی نۆبڵی پێبەخشراوە، دیارە ئەمەش بەلای لاوی خوێنگەرم و زانست دۆستی کورد شتێکی ئەستەم نییە و دەخوازین ئەم ئاواتە بە زووترین کات بێتە دی.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| کەم دەرامەت | : | ئەو کەسێ داهاتا وی کێمە، هەژار، نەدار |
| تەمەنی لاویی | : | ژیانی لاوییەتی، تۆلازی |
| ڕوویکردە | : | بەرێ خۆ دایێ |
| بەپێی ڕاسپاردەی | : | لە سەر داوای |
| ئەستەم | : | زەحمەت، گران |
| بێتە دی | : | ئەنجام بدرێت ، بەدەست بهێت |



## ڕاهێنان

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. ماددەی نیترۆگلسرین ............... دەتەقێتەوە.

(زۆر درەنگ، زۆر بەخێرایی، بە ئاگر)

٢. نۆبل لە خێزانێکی ............... لەدایک بووە.

(دەوڵەمەند، دەرەبەگ، کەمدەرامەت)

٣. نۆبڵ ساڵێک لە ............... مایەوە.

(ئەوروپا، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کەنەدا)

٤. لەبەر دروستکردنی دینامێت، نۆبل پشتگیری لە ............... کردووە.

(ڕێکخراوەکانی ئاشتی، ڕێکخراوی خاچی سوور، ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان)

٥.خەڵاتی ئاشتی بە ڕاسپاردەی پێنج کەس لە پەرلەمانی ............... دەدرێت.

(دانیمارک، سوید، نەرویج)

# مەلا مستەفای بارزانی



پێشەواو سەرکردەی بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی کورد مەلا مستەفای بارزانی کوڕی شێخ محەمەد کوڕی شێخ عەبدولسەلامی بارزانییە، لە ڕۆژی چواردەی مانگی ئاداری ساڵی ١٩٠٣ی زایینی لە گوندی بارزان هاتۆتە دنیاوە. بەر لەوەی لەدایک بێت شێخ محەمەدی باوکی کۆچی دوایی کردووە و دایکی بەبێ باوک بەخێوی کردووە. کە تەمەنیشی دەگاتە سێ ساڵان، شێخ عەبدولسەلامی برا گەورەی کە ناسراو بوو بە شێخ عەبدولسەلامی دووەم لە دەوڵەتی عوسمانی ڕاپەڕیوە و سوپای ئەو دەوڵەتەش هێرشی بردۆتە سەر بارزان و هەموو خاووخێزانی بارزانییەکانی گرتووە و مەلامستەفا ودایکیشی بەر ئەو هەڵمەتەی گرتن کەوتوون و نۆ مانگ لە بەندیخانە ماونەتەوە.

له ساڵانی ١٩٣١و ١٩٣٢ی زایینیدا مەلا مستەفای لاو یارمەتیدەری شێخ ئەحمەدی برای بووە، لە ڕاپەڕینەکەی لە دژی حکومەتی عیراقداو خۆشی لە ساڵانی ١٩٤٣- ١٩٤٥ی زایینی شۆڕشی دووەمی بارزانی بەرپا کردووە.
لیژنەیەکی سیاسی بۆ ڕزگارکردنی کوردستان بەناوی (لیژنەی ئازادی) بە سەرۆکایەتی خۆی دامەزراندووە، لەو شۆڕشە دوای چەند شەڕو ئاگر بەست، لەبەر نا هاوسەنگی چەک و هێزی شەڕکەر لەگەڵ حکومەتی عیراق، لە ساڵی ١٩٤٥ی زایینیدا بارزانی و جەنگاوەران و خاوخێزانیان چوونە ناو کوردستانی ئێران و کەوتنە پاڵ بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستانی ڕۆژهەڵات و بەشدارییان لە دامەزراندنی کۆماری دیموکراتی کوردستان کرد بە سەرۆکایەتی پێشەوا قازی محەمەد لە ٢٢ی کانونی دووەمی ١٩٤٦ی زایینی ڕاگەیانرا، بارزانی بووە سەرکردەی سوپای پارێزگاری ئەو کۆمارە ساوایەی کورد و پلەی ژەنەڕاڵی پێدرا، کاتێکیش ئەو کۆمارە لەناوبرا بارزانی نەمر لە ١٩٤٧ی زایینی چووە یەکێتی سۆڤیەتی جاران و یازدە ساڵ لەو وڵاتە خۆی و جەنگاوەرانی بوونە پەناهەندەی سیاسی تاکو لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ی زایینی لە عیراق، گەڕایەوە وڵات.
ئەم پێشەوایەی نەتەوەی کورد کە زانی فەرمانڕەوایی ئەو کاتە مافی نەتەوەیی کورد نادەن و ڕۆژبەڕۆژ باری کوردستان لە ڕێگەی پیاوەکانییانەوە ئاڵۆزتر دەبێت لە ١١ی ئەیلوولی ١٩٦١ی زایینیدا شۆڕشی ئەیلوولی ڕزگاریخوازی کوردستانی بەرپاکرد.

تاکو له (١١)ی ئاداری ١٩٧٠ی زایینی حکومەتی بەغدا ناچاربوو ڕێککەوتنامەی ١١ی ئادار لەگەڵ بارزانی سەرکردەی شۆڕشی ئەیلوول مۆربکات، بەو نیازەی ئۆتۆنۆمی بدرێت بە کوردستانی عیراق کە چی حکومەتی عیراق کەوتە پیلان دانان و له ٦ی ئاداری ١٩٧٥ی زایینی له جەزائیر ڕێکەوتننامەیەکی خیانەتکارییان مۆرکرد و له ئەنجامی ئەم کارە نامەردانەیە شۆڕشی ئەیلول نسکۆی هێنا. بەڵام میللەتی کورد کۆڵی نەدا.

بارزانی له ساڵی ١٩٧٩ی زایینی ماڵئاوایی له کورد و کوردستان کرد.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| پێشەوا | : | سەرۆک، ڕێبەر |
| هەڵمەت | : | هێرش |
| ڕاپەڕین | : | سەرهەڵدان |
| پەناهەندە | : | پەنابەر |
| بەرپاکرد | : | هەڵگیرساند |
| مۆرکرا | : | واژۆکرا |

# ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. کەی بارزانی لەدایک بووەو لە کوێ؟

٢. شۆڕشی ئەیلول لە چ ڕۆژ و مانگ و ساڵێکدا هەڵگیرسا؟

٣. بارزانی کوڕی کێ بوو؟

٤. بۆچی بارزانی شۆڕشی ئەیلولی هەڵگیرساند؟

٥. کێ سەرۆک کۆماری دیموکراتی کوردستان بوو؟

٦. لە چ ڕۆژ و مانگ و ساڵێک کۆماری کوردستان دامەزرا؟

پەندی پێشینان :-

ڕاست بە لە ڕێگەی شێر بڕۆ.

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:

١. لیژنەی ئازادی بە سەرۆکایەتی ............... دامەزرا.

٢. بارزانی مستەفا لەدوای شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ی زایینی گەڕایەوە ...............

٣. شۆڕشی ............... لە ساڵی ١٩٧٥ی زایینی نسکۆی هێنا.

٤. بارزانی نەمر کوڕی ............... کوڕی ...............

٥. لە ساڵی ............... بارزانی و جەنگاوەران و خاووخێزانیان چوونە ناو کوردستانی ڕۆژهەڵات.

**پەندی پێشینان:-**

ئەوەی حیسابی پاکە
لە موحاسەبە بێباکە

# چالاکـــی

خوێندکاری خۆشەویست: لە خوارەوە ناوی چەند سەرکردەیەکی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردستانتان بۆ دەنووسین، لە بەرامبەر ناوەکانیان، ئەو شوێنانە بنووسن، کە شۆڕشیان تیادا هەڵگیرساندووە:

١. شێخ مەحموودی نەمر/ لە کوردستانی ................

٢. شێخ سەعیدی پیران/ لە کوردستانی ................

٣. قازی محەمەد/ لە کوردستانی ................

٤. سمکۆی شکاک/ لە کوردستانی ................

ئەگەر پێویست بوو، با مامۆستا یارمەتیتان بدات.

وتەی ناوداران: -

( زۆرداری ئەگەر سەریش بکەوێت تەمەنی کورتە)

# پەڕتووکێک باسی خۆی دەکات





پەڕتوک گوتی: حەوت هەزار ساڵ لەمەوبەر، لێرە لە خاکی (میزۆپۆتامیا) لەدایک بووم.

سەرەتا لە شێوەی تاتەخشتی وەک بەرد هەڵگەڕاودا بووم، لە پەڕتوکخانەکانی ئەو سەردەمەدا هەڵگیرابووم و دەست و چاوی دڵسۆزان ئاگادارییان دەکردم و پارێزگارییان لێدەکردم، ساڵ لە دوای ساڵ پێمەوە ماندوو دەبوون و خزمەتیان دەکردم، تا جوان بووم و چوومە شێوەی کاغەزی تۆمارکراوەوە، کە بە ئاسانی بتوانن هەڵمبگرن و بمپارێزن، بە نووسینی جوان و وێنەی ڕەنگاوڕەنگ و ڕەش و سپی ڕازاندومیانەوە، لە دروستکردنم کاغەزی سپی ناسک و چاپخانەی نوێیان بۆ هەڵبژاردووم.

من ئەمڕۆ یەکێکم لە تەواوکەرەکانی ژیان، ناکرێت وازم لێ بهێنرێت دەسبەردارم بن.

دوتوێی لاپەڕەکانم سەربووردە و چیرۆکی خۆشی پێشینان و هاوچەرخ و پەیامی زانستی و سامان و کەلەپووری باو و باپیرانی گرتۆتە خۆ، کە بە هۆی منەوەیە، لەیاد چوونەوە و لەناوچوون دەپارێزرێن.

هیچ نهێنییەکی بە کەس ناڵێم و لای کەسیش نایدرکێنم، ئەگەر خاوەنەکەی نەخوازێت بڵاوببێتەوە.
هاوڕێیەکی بەسودی ڕۆژانەتانم، دەتوانم ڕابردوو و ئێستا و ئایندەشتان بخەمە بەردەست.
مرۆڤایەتی لە ڕێگەی منەوە بە بەرزترین پلە و پایە دەگات، دوژمنی سەرسەختی گەورەترین دەردی دواکەوتنی کۆمەڵگەم، کە ئەویش نەخوێندەوارییە.
پەڕتوک ئەو گەنجینەیە، کە پڕیەتی لە خشڵی بایەخدار، کە هۆشمەندان و روناکبیران خۆیانی پێدەڕازێننەوە. پەڕتوک: گەنجینەی بیر و هۆش و زانیاری و شەونخونی زانایان و بوێژان و ئەدیبانە، کە تەمەنی خۆیان لە پێناویدا بەسەربردووە، هەر لەبەر ئەوەشە، کە بەچاکترین هاوڕێ دادەنرێت.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| میزۆپۆتامیا | : | دۆڵی نێوان هەردوو ڕوباری دیجلە و فوڕات |
| تاتەخشت | : | خشتی پانی وەک بەرد |
| سەربووردە | : | سەرگوزشتە، بەسەرهات |
| مەحاڵە | : | بەهیچ جۆرێک |
| هاوچەرخ | : | هاوکات، سەردەم |
| کەلەپوور | : | سامانی نەتەوایەتی |
| ئایندە | : | دوارۆژ، داهاتوو |
| گەنجینە | : | کۆگە |



# ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. بە مەزندە، کەی و لە کوێ پەڕتوک لەدایک بووە؟

٢. پەڕتوک دەڵێت دەتوانم گێتیتان پیشانبدەم، چۆنی ڕوون دەکەیتەوە؟

٣. چاکترین هاوڕێ بۆ مرۆڤ چییە؟

٤. دوور لە پەڕتوکخانەی قوتابخانە، ئارەزووی چ جۆرە پەڕتوکێک دەکەیت بیخوێنیتەوە؟

٥. تا ئێستا چەند پەڕتوکت خوێندۆتەوە، دەتوانیت ناوی هەندێکیان بڵێیت؟

* پەڕتوک چاکترین هاوڕێی مرۆڤە *

# ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:

١. پەڕتوکەکە گوتی: ..............لەمەوبەر لە خاکی ............ لەدایکبووم.

٢. پەڕتوک یەکێکە لە تەواوکەرەکانی ................

٣. پەڕتوک ئەو گەنجینەیە کە پڕیەتی لە ................

٤. پەڕتوک گەنجینەی بیر و هۆش و ............... زانایان و ئەدیبانە.



# کەچا کورد



ئەی کەچێ ڕابە بخوینە دا تو سەربەست هەر بژی
زوو ژ خەو تو سەر هلینە بەس بمینە بێ مەژی

ڕەنجبەرا هوندر تویی تم ڕندو ژیرو زانە بە
بۆتە بێتر هەر دڤێتن خوندەواری و پاقژی

وا هەڤالێن تە ل هەرجێ سەربلند پێشڤە دچن
ڕابە سەر خوە ئەی کەچا کورد سەر بلند بمرە تو ژی

گەر بخوینی دێ بدێ خوەندن تو ئێ هوندر تەڤا
گەر نەخوێنی کەس ژ بۆمە ئێش و دەردا ناکوژی

وا جەگەرخوین خوەش دنالی دا کۆ ژن پێشڤە هەڕن
دا ببێژن هەربژی کورد هەربژی

جگەر خوێن

* جگەر خوێن: هۆزانڤانەکێ مەزنبوو، سالا (١٩٠٣ز) ل گوندێ حەسار هاتە دنیایێ، ل سالا (١٩٨٤ز) ل ستۆکهۆلم چوویە بەر دلۆڤانییا خودێ.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| ڕابە | : | هەستە |
| ژ خەو | : | لە خەو |
| سەر هلینە | : | سەر بلندکە |
| بێ مەژی | : | بێ مێشک |
| هوندر | : | ناومال، ناوخۆ |
| تم | : | هەمیشە |
| بێتر | : | پتر، زێتر |
| دڤێتن | : | دەیەوێ |
| دێ بدێ خوەندن تو | : | تۆ خوێندەواری دەدەیتە |
| ئێ هوندر تەڤا | : | ئەوانەی لەناو ماڵن هەموویان |

## داڕشتن:

خوێندکاری خۆشەویست:

**چەند دێڕێک لەسەر خۆشەویستی دایک و باوک بنووسە.**

# جوانی



جوانی لە بەژن و باڵاو لەش و لاری ڕێکو پێکدایە، جوانی لەبیری ڕوناک و هەستی بڵند و کردەوەی شیریندایە، لە خۆشەویستیدایە، لە یەکێتی و یارمەتیدایە.

جوانی بۆ بەرەنگاریکردنی زۆرداری لەخەبات و تێکۆشانی گشت لایەکدایە، بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری و هەژاری و دەردەداری، بۆ ئازادکردنی کوردان، بۆ ئاوەدانکردنەوەی کوردستان، بۆ یاریدەدانی داماوان و لێقەوماوانی جیهان.

جوانی لەو گەورەییەدایە، کە خەمی بچووک دەخوات، لە بیر و هۆشەدایە، کە چارەسەری گیروگرفت دەکات.

لەو هێزەدایە، کە پارێزگاریی داد دەکات، لەو خوێندەوارییەدایە، کە نەخوێندەواری لادەبات، لەو سامانەدایە، کە هەژاری و نەبوونی لەناو دەبات، لەو پزیشکایەتییەدایە، کە چارەسەری نەخۆشی دەکات و برین سارێژ دەکات. جوانی لەو دڵتەڕییەدایە، کە ژیانی هەموان

پڕ لە سازو ئاواز و بەزم و ڕەزم و شادی دەکات. جوانی لە سروشتی ڕەنگاوڕەنگ و پڕ پیت و فەڕدایە ، لەگەڵ نەوەی ئادەمدا، کە هونەرمەندیی خوای گەورە و پاک و بێ هاوتا دەردەخەن.

کوا ئەو ڕۆژەی جوانیی جیهان لە پەروەردەی دانیشتوانی جیهان ببینم! دەستی یارمەتیمان بۆ درێژ بکەن و کوردەوارییەکی ئازادو پێشکەوتوو، کوردستانێکی ڕازاوە و ئاوەدان پێکبهێنن، تا ئێمە ببینە ئەندامێکی بەهێزو بە کەڵک و دەستی یارمەتی درێژ بکەین بۆ ئەو گەلانەی لە کورد کلۆڵترن و نیشتمانەکەیان لە کوردستان کاولترە!!

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| ڕۆشن | : | ڕوناک |
| بڵند | : | بەرز |
| گیروگرفت | : | کێشە |

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. تۆ جوانی لە چی دەبینی؟

٢. چۆن وەک چەکێک جوانی بەکاردەهێنی؟

٣. چۆن دەیسەلمێنی خوێندەواری بەشێکە لە جوانی؟

تێبینی: -

مامۆستا دەتوانێت یارمەتی قوتابییان بدات بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکان لەبەر ڕۆشنایی دەقی بابەتەکە.

# ڕۆژنامەگەریی کوردی


عدد ۱

سال اولی

کردستان

۱۳۱۵

عنوان

مقداد مدحت

له (٢٢) بیست و دووی نیسانی هەموو ساڵێکدا، ڕۆژنامەنووسان و خامەبەدەستان بە شکۆدارییەوە جەژنی ڕۆژنامەگەری و وشەی ڕەسەنی کوردی پیرۆز دەکەن، لەبەر ئەوەی لەو ڕۆژە، لە ساڵی (١٨٩٨)ز یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی بەناوی (کوردستان) لەسەر دەستی (میقداد مەدحەت بەدرخان) لە قاهیرەی پایتەختی میسر چاوەکانی هەڵهێناوە و ئیدی کاروانی ڕۆژنامەگەری و وشەی ڕەسەنی کوردی لەو ڕۆژەوە دەستی پێکردوە و بە گەلێ قۆناغی جیا جیادا تێپەڕیوە، تا بە قۆناغی زێڕین و گەشی ئەمڕۆ گەیشتووە. بێگومان لەدایکبوونی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی بە پلەی یەکەم سەرورەرییەکەی بۆ خودی بنەماڵەی بەدرخانییەکان دەگەڕێتەوە، کە ئەو بنەماڵە بەڕێزە هەمیشە خاوەنی کەسایەتی نیشتمان پەروەرو روناکبیری سەردەمی خۆیان بوون. دەرکردنی ڕۆژنامەی کوردستان لە بارودۆخێکی تایبەتی خۆیدا سەرەتایەکی پرشنگدار بووە بۆ چوونە نێو ژیانی هوشیاریی نەتەوەیی و پتر پەرەپێدان و خزمەتکردنی زمان و ئەدەب و ڕۆشنبیری و کلتوری ڕەسەنی کوردی. هەروا یەکەمین گۆڤاری کوردی ساڵی ١٩١٤ز لەژێر ناوی (بانگی کورد) بوو، کە

لەلایەن (جەمالەدین بابان)ەوە دەرچووە، ئەو گۆڤارە تا هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهان تەنیا (٥) پێنج ژمارەی لێدەرچووە، بەڵام یەکەم گۆڤاری کوردی کە بۆ یەکەم جار لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردیدا وێنەی فۆتۆگرافی بڵاوکردۆتەوە (ڕۆژی کورد) بووە، ئەوەش لە ڕۆژی ٦ی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٣ز لە لایەن کۆمەڵەی (هێڤی) کورد لە ئەستەمبۆڵی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی تەنها (٣) سێ ژمارەی لێدەرچووە.

خاوەنی ئیمتیاز و بەڕێوەبەری گۆڤاری ڕۆژی کورد خوالێخۆشبوو (عەبدولکەریم مەحمود ڕۆستەم) ناسراو بە (عەبدولکەریم شالۆن) بووە.

ڕۆژنامەگەری ڕۆڵێکی یەکجار گرنگی هەیە، لە ژیانی ڕۆشنبیری و شارستانیی هەموو میللەت و نەتەوەیەک، ئەگەر بەشێوەیەکی لەبار بەکاربهێنرێ دەبێتە مایەی، بەرزبوونەوەی ئاستی هۆشیاریی جەماوەر، لە سەردەمی ئێستا دەبینین ڕۆژانە بەدەیان ڕۆژنامە و گۆڤار دەردەچن.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| خامە | : | پێنووس |
| شکۆدار | : | پایەبەرز |
| سەروەری | : | شانازی |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. ناوی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی چی بوو؟

٢. ساڵی چەند یەکەمین گۆڤاری کوردی دەرچوو، بەناوی چی بوو؟

٣. کام گۆڤار بوو، بۆ یەکەم جار وێنەی فۆتۆگرافی بڵاوکردەوە؟ لەلایەن چ کۆمەڵەیەک دەردەچوو؟

٤. بەڕێوەبەری گۆڤاری ڕۆژی کورد ناوی چی بوو؟

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:

١. لە ساڵی ............... یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی دەرچوو.

٢. ڕۆژنامەگەری دەبێتە ............. بەرزبوونەوەی ئاستی هۆشیاری جەماوەر.

٣. گۆڤاری بانگی کورد لەلایەن ................ ە دەرچووە.

## چالاکی (١)

وشە پەیوەندیدارەکان بە هێڵێک بگەیینە بەیەک:

| | |
|---|---|
| بانگی کورد | میقداد مەدحەت بەدرخان |
| ڕۆژنامەی کوردستان | جەمالەدین بابان |
| ڕۆژی کورد | کۆمەڵەی هێڤی |

## چالاکی (٢)

ناوی (٥) پێنج ڕۆژنامە و (٥) پێنج گۆڤاری کوردی بنووسە، کە ئێستا دەردەچن؟

# * ماسییە بچکۆلەکە *



ماسییەکی زل، لە گۆمێکی شیندا، بە فیزێکەوە، دەسووڕایەوە و دەهات و دەچوو. لە دوورەوە چەند ماسییەکی بچکۆلەی دی، کە لەیەکدی کۆبووبوونەوە.

ماسییە بچکۆلەکان، هەر کە لە دوورەوە چاویان بەو ماسییە گەورە کەوت، ترسان و هەریەکەیان بەلایەکدا تێیتەقاند، ماسییەکیان نەبێت، کە لەبەر لووتی ماسییە گەورەکە وەستا و نەجوولا!

– ماسییە گەورەکە ئەمەی بەلاوە سەیر بوو، لە ماسییە بچکۆلەکە چووە پێشەوە و پێیگوت:

دەبینم تۆ وەک ماسییە بچکۆلەکانی هاوڕێت نەبووی!

ئەوان کە چاویان بە من کەوت، هەر یەکەیان بەلایەکدا ڕایکرد.

– ماسییە بچکۆلەکە پێیگوت: چ پێویست دەکات لێت بترسم؟

* نووسەر (تایەر سالح سەعید)ی چیرۆکنوس، خاوەنی ئەم چیرۆکەیە لە ساڵی ١٩٤٢دا لە سولێمانی لە گەرەکی چوارباخ لە بنەماڵەیەکی رۆشنبیر لەدایکبووە، ئامادەیی پیشەسازی لە سولێمانی و بەغدا تەواوکردووە، تا ئێستا چوار کۆمەڵە چیرۆکی منداڵان و گەورەی بە چاپ گەیاندووە.

– ماسییه گەورەکە، بە تووڕەییەوە گوتی:
ئەی لەوە ناترسیت بتخۆم؟
– ماسییە بچکۆلەکە بێ ئەوەی خۆی تێکبدات پێیگوت:
هەرگیز لەوە ناترسم، بەڵام ئەی تۆ شەرم ناکەیت، کە من و ماسییە بچکۆلەکانی هاوڕێم لێت بترسین؟
ماسییە بچکۆلەکە لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و گوتی:
سەیرە، ماسی بۆ لە ماسی بترسێت، کە هەردوو لایان هەر ماسیین!؟
ماسییە گەورەکە، لە قسەکانی ماسییە بچکۆلەکە حەپەساو بیریکردەوە، لە دڵی خۆی گوتی:
– قسەکانی ئەم ماسییە زۆر لە ڕاستییەوە نزیکن، وایە بۆچ ماسیی گەورە ماسیی بچووک بخوات؟ ئایا ئەوان لە ئێمە نین!؟
ئایا کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئێمە وەک ئێستای ئەوان بچووک بووین، پێمان خۆش بوو، ماسییە گەورەکان بمانخۆن!؟ ئەگەر ماسییە گەورەکان ئێمەیان بخواردایە، ئێستا لە کوێ دەبووین بەم ماسییە گەورە و زەبەلاحەی، کە هەین!؟
– ماسییە گەورەکە بە دەم بیرکردنەوەوە ماسییە بچکۆلەکەی بەجێهێشت، لە دڵی خۆی بیری لە قسەکانی ماسییە بچکۆلەکە دەکردەوە.
ئینجا بیرکردنەوە، ماسییە گەورەکەی دەهێنایە سەر قسەکانی ماسییە بچکۆلەکە و بڕیاری دا هەتا هەتایە دەست لە خواردنی ماسییە بچکۆلەکان هەڵبگرێت، بە هەر ماسییەکی گەورەش بگات، قسەکانی ماسییە بچکۆلەکەی بۆ بگێڕێتەوە.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| زل | : | گەورە، مەزن، زەبەلاح |
| تێیتەقاند | : | بۆیدەرچوو، ڕایکرد |
| فیز | : | لە خۆبایی، لووت بەرز |
| حەپەسا | : | سەرسام بوو |

مامۆستا:- ئەم دێرە هۆنراوەی خوارەوە بۆ خوێندکاران ڕاڤە دەکات

هەتا کەی خاکی کوردان بێکەس و بێیار و پەرچەم بی
تەماشای مانگی نیسان کە هەور بۆ کوردستان ئـــەگری

قانیع

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەوە:

١. ماسییە بچکۆلەکان بۆچی ترسان و هەر یەکەیان بە لایەکدا تێیان تەقاند؟
٢. ئەو ماسییە بچکۆلەیەی نەترسا، چی بە ماسییە گەورەکە گوت؟
٣. دوا بڕیاری ماسییە گەورەکە چیبوو؟
٤. ناوی هەندێ جۆری ماسی بڵێ؟

## داڕشتن:

قوتابی خۆشەویست: چەند دێرێک لەسەر تەبایی و بەیەکەوە ژیان بنووسە.

# تۆفیق وەهبی



زانای گەورەمان تۆفیق وەهبی بەگ کوڕی مەعروف کوڕی موحەمەدە، ساڵی ١٨٩١ز لە سولێمانی لەدایک بووە.
ساڵی ١٩٠٨ز لە بەغدا فێرگەی سەربازیی ناوەندی تەواوکردووە، بۆ خوێندن چووەتە ئەستەنبۆل و بە پلەی ئەفسەری بەشداری گەلێک لەو جەنگانەی کردووە، کە دەوڵەتی عوسمانی ئەنجامیداوە، لە جەنگی یەکەمی جیهاندا گەلێک نیشانەی پاڵەوانیەتی وەرگرتووە.
ساڵی ١٩١٩ز گەڕایەوە عیراق، لەگەڵ دامەزراندنی لەشکری عیراق، تۆفیق وەهبی کرایە ئەفسەری بەشی بزووتنەوەی ئەو لەشکرە.
ساڵی ١٩٢٢ز خۆی دایە پاڵ شێخ مەحموود، کە حکومەتەکەی شێخ مەحموود نەما، (تۆفیق وەهبی) ماوەیەک بەندکرا، پاشان ڕێگەی پێدرا بگەڕێتەوە ناو لەشکری عیراق و ساڵی ١٩٢٥ز کرا بە بەڕێوەبەری فێرگەی سەربازیی لە بەغدا.

لەساڵی ١٩٣١ز بە دواوە، دەستی لەکاری سەربازی هەڵگرت، وەک کارگێڕێکی ناسراو لە دەزگاکانی دەوڵەت کاریکردووە، بەر لە ڕاپەڕینی شەشی ئەیلوولی ١٩٣٠ز، دەستی لەکار کێشایەوە.

لە ساڵی ١٩٤٤ز بە دواوە، قۆناغێکی نوێ لە ژیانی تۆفیق وەهبی دەستی پێکرد، چەند جارێک بوو بە وەزیر و بریکاری وەزیر.

لە کۆتایی سییەکانەوە لە کاری سیاسی دوورکەوتەوە و زیاتر مێشکی دەوڵەمەندی خامەی بەبڕشتی بۆ خزمەتی وشەی کوردی تەرخانکردووە.

زانایی تۆفیق وەهبی زوو دەرەوشایەوە و ڕێگەی بۆ خۆشکرد ببێتە ئەندامی کارا و جێگری یەکەمی سەرۆکی (کۆڕی زانیاری عیراق) لە ڕێگەیەوە بەشداری لە گەلێک کۆنگرەی زانستیی جیهانی کردووە بەناوی عیراق.

ساڵی ١٩٧٠ز کە کۆڕی زانیاری کورد لە بەغدا دامەزرا، تۆفیق وەهبی بە یەکەم ئەندامی شەرەفی ئەو کۆڕە هەڵبژێردراوە.

تۆفیق وەهبی لە بواری زانستدا لە هەموو شتێک زۆرتر بایەخی بە زمانی کوردی دەدا، چونکە باش لەوە گەیشتبوو، کە لە بارودۆخی ناسکی کوردستاندا زمان قەڵغانی یەکەمی پاراستنی نەتەوەیە.

ئەدمۆنس(١) لە گۆڤاری (ڕۆیال)ی لەندەنیدا، ساڵی ١٩٤٥ز دەنووسێت: (تۆفیق وەهبی توانیویەتی بە داڕشتنی زنجیرەیەک وشەو زاراوەی کوردیی پەتی و لەبار، بەر لە لێشاوی ئەو وشە عەرەبییە نوێیانە بگرێت، کە لەگەڵ بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانی خۆیان لەناو زمانە خۆر هەڵاتییەکاندا سەپاند).

(١) ئەدمۆنس: کاریەدەستێکی بەریتانی بوو، لە سولێمانی دەسەڵاتداربووە.

دیسان ئەدمۆنس دەنووسێت و دەڵێت:
(کوردو نەوەی داهاتووی کورد قەرزاری ئەو زانایەن).
لەبەر خزمەتگوزاری و پایە بەرزی تۆفیق وەهبی کاتێک لە ساڵی ١٩٨٤ز تەرمەکەی هێنرایەوە بۆ کوردستان، بە هەزاران کورد بەشداری ڕێورەسمی ناشتنی تەرمەکەیان کردووە، لەسەر داوای خۆی، تەرمەکەیان بە چیای پیرەمەگرونی سەرکەش سپارد. چەند پەرتووکێکیش بەرهەمی بەبڕشتی خامەی ئەم پیاوەن:

١. دەستووری زمانی کوردی.
٢. ڕێنووسی کوردی بە پیتی عەرەبی و لاتینی.
٣. بارامی گوڕ.
٤. گەشتی ملەی تاسڵوجە.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| لەشکر | : | سوپا |
| درەوشایەوە | : | دەرکەوت |
| کارا | : | لێهاتوو |
| بەبڕشت | : | بەپێز |
| سەرکەش | : | سەربڵند |

## ڕاهێنان (١)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:

١. تۆفیق وەهبی سالّی ............ لە .............لەدایک بووە.

٢. لە چاپکراوەکانی تۆفیق وەهبی بەگ ١. ..............

٢. .............. ٣. ..............

٣. لە کۆتایی سییەکانەوە لە ............ دوورکەوتۆتەوە.

٤. تۆفیق وەهبی لە بواری زانستیدا بایەخی .............. داوە.

٥. ئەدمۆنس دەڵێت: کورد و نەوەی داهاتوو ...............

## ڕاهێنان (٢)

ئەم وشانە بخەرە ڕستەوە:

(فێرگە، زانیاری، خامە، قەڵغان، پیرەمەگرون)

# کۆمپیـــــــــــوتەر



منداڵە خۆشەویستەکان، (کۆمپیوتەر) ئامێرێکە بە وزەی کارەبا کار دەکات و بە شێوەیەک لەلایەن زانایانەوە دروست کراوە، کەوا کارو فەرمانەکانی مرۆڤ زۆر بەوردی و بەخێرایی جێبەجێ دەکات.
کۆمپیوتەر لە چەند بەش و پارچە پێک هاتووە کە ئەمانەن:



## کەیس (سندوقی کۆمپیوتەر):

لە شێوەی سندوقێکدایە شێوەیەکی ستوونی و ئاســۆیی هەیە و بەشی هەرە سەرەکی (کۆمپیوتەر)ە، چونکە هەموو بەش و یەکە سەرەکییەکانی کۆمپیوتەری تێدایە و جێگەی ئیشپێکردنی (سی دی) و دوگمەی پێکردن و کوژاندنەوەی کۆمپیوتەرەکەی لەسەرە، هەروەها شوێنی پێوە بەستنی گشت دەزگاکانی دیکەی هەیە.

## مۆنیتەر (شاشە):



هەروەکو شاشەی (تەلەفزیۆن) وایە، جگە لە وایەر و کێبڵی وزەی کارەبا بە وایەرێکی دیکە تایبەت بە (کەیس) ەوە دەبەسترێت. (شاشە) بۆ بینینی ئەنجامی هەموو ئەو کارانەیە، کە لە کۆمپیوتەرەکەوە ئەنجامی دەدەین.

## کیبۆرد (بۆردی دوگمەکان):



(کیبۆرد) لە شێوەی تەختەیەکی دوگمەدارە، چونکە کۆمەڵێک دوگمەی لەسەرە، هەندێ لە دوگمەکان تایبەتن بە پیتەکانی زمانی ئینگلیزی و عەرەبی و کوردی و هەروەها دوگمەی تایبەت بە ژمارەکان و هێما نێودەوڵەتییەکان و هی دی لەسەرە، بە شێوەیەکی گشتی (کیبۆرد) بۆ پێدانی زانیاری بە کۆمپیوتەر بەشێوەی (نووسین) بەکاردەهێنرێت.

## (ماوس):



ئەمەش دەزگایەکی بچووکە بۆ پێدانی زانیاری کۆمپیوتەر بەکاردێت، بەڵام بەشێوەی داگرتنی دوگمەکانی کە لەسەریەتی و پێی دەگوترێت کلیک کردنی هێمای (ماوس) وەکو تیرێک لەسەر (شاشە) دەردەکەوێت و بە جووڵاندنی نەرمی (ماوس) بەئاسانی تیرەکە دەجوولێت و دەچێتە شوێنی مەبەست و کاری پێدەکرێت.

## سپیکەر  یان (ئامێری دەنگ بیستن):



بریتییە لەو ئامێرەی کە بۆ گوێ بیست بوونی دەنگ بەکاردێت، چ لە کاتی کارپێکردنی (سی دی) بێت یان بۆ ئەو زانیارییانەی کە بەشێوەی دەنگ لەناو کۆمپیوتەر کۆگە کراون.

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەوە:

١. کۆمپیوتەر بەچی کار دەکات؟

٢. کۆمپیوتەر لە چەند بەش و پارچە پێک دێت بیانژمێرە؟

٣. کام بەش ڕۆڵی سەرەکی هەیە لە ئامێری کۆمپیوتەر؟

## چالاکی

مامۆستای بەڕێز: ئەگەر بکرێت ئامێری کۆمپیوتەر و بەشەکانی پیشانی خوێندکاران بدرێت.

# سەدەی زانست



ڕەوشـــت، زانســت، پـەروەردە
هەتوانـــی زامـــی کـــوردە
مـرۆڤ بـە بیر و زانســـت
هەوڵدان، تـەکـان، توانسـت
تێدەگـا چۆن دنیـای نـــوێ
سـەردەکەوێ ... نانـــەوێ
هـــەر ڕۆژە و داهـێنانـــێ
جـۆرە بەرهـەم هـێنانـــێ
زۆربـوونـی ئـامـێرەکـــان
گەشت بەرەو ئـەستـێرەکـان
(کۆمپیـوتـەر) و (ئـیـنتەرنێت)
نەزانـین لـە گـۆڕ ئەنێـت
هـەنـگـاوی (فـۆتـۆکـۆپـــی)
شـۆڕشـە دژ بـەکـپـــی
ئەمـانە گشـتی بـۆ گـەل
مـایـەی سـوودن بۆ کۆمـەڵ
ڕۆڵـەی کـوردم، بـا ئێمـەش
لـەم ڕەوتـە نـەبین بـێ بەش
مـێژوو لـە (هـەزارەی سـێ)
بـەزێـڕ نـاومـان بـنووسـێ

(عەلی بەختەوەر)

لەساڵی (١٩٥٣) ز لە هەولێر لەدایک بووە دەرچووی ئامادەیی کشتوکاڵییە، (٥) نامیلکەی شیعری بەچاپ گەیاندووە.

# واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| هەتوان | : | چارەسەر، دەرمان |
| نانەوێ | : | ناچەمێ، نابەزێ |
| داهێنان | : | دروستکردن و هێنانەدیی شتی تازە |
| گەشت | : | سەفەر |
| لە گۆڕ ئەنێت | : | لەناو دەبات |
| هەنگاو | : | شەقاو |
| کپی | : | بێدەنگی، خامۆشی |
| تەکان | : | بزاڤ |
| توانست | : | توانا |

# لەیلا قاسم



لەیلا قاسمی جوانەمەرگ لە ساڵی (١٩٥١) ز هەزارو نۆسەدو پەنجاو یەک زایینی لە شاری خانەقین لەدایک بووە. چاوی بە دیمەنە جوانەکانی ئەو شارە قەشەنگە هەڵێناوە و پشکووتووە.
ئەو بەژن و باڵاکەی هاوتەریب لەگەڵ هۆش و بیری مەزن دەبوون، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە خانەقین تەواوکردووە تا پۆلی چوارەمی لە بەشی کۆمەڵایەتیی کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا خوێندووە.
لەیلا قاسم زۆر بەجەرگ و چاو نەترس و قارەمان و کوردپەروەر بوو، زۆر خەباتگێڕ و ئازاو بەتوانا بوو، بەڵام لەدوای ئەوەی ڕژێمی بەعس سۆز و پەیمانی شکاند و لەو بەڵێنانەی بە کوردی دابوون لە ١١ی ئاداری (١٩٧٠)ز پاشگەزبوەوە هەر زوو بە دیارکەوت کە ئەم ڕژێمە خەریکی فڕوفێڵ و پیلان دارشتنە بۆ لەناوبردنی کوردو شۆڕشەکەی، ئەوەبوو لە بەهاری ساڵی (١٩٧٤) زایینی هێرشی کردە سەر کوردستان.

لەیلا لەو دەمەدا زۆر بەگەرمی  خەریکی کاری ڕێکخستن بوو. ئەوەی جێگای داخە دەستی ڕەشی سیخورە ڕەگەز پەرستەکان گەیشتە لەیلاو هاوڕێکانی و گیران. ئەم گەنج و لاوە نازدارانە کەوتنە ژێر ئازار و ئەشکەنجە بەڵام خۆڕاگری و ورەبەرزی ئەم لاوە قارەمانانە ترس و سامی پێشمەرگەیان لە دڵی دوژمنان زیاتر کرد، ئەو دڵڕەشانە کینە و ڕکی خۆیان بەم لاوانە ڕژاند و بڕیاری لە سێدارە دانیان بۆ دەرکردن. بەڵام ناو وناوبانگی لەیلا لە سەرووەری شەهیدان تۆمارکراوە و هەرگیز لە یاد ناکرێت.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| جوانەمەرگ | : | بە گەنجی مردن |
| قەشەنگ | : | جوان |
| مەزن | : | گەورە |
| پاشگەزبووەوە | : | پەشیمان بووەوە |
| سیخوڕ | : | شۆفار |
| ئەشکەنجە | : | لێدان |

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. لەیلا قاسم کەی و لە کوێ لەدایکبووە؟

٢. بۆچی لەیلا لە سێدارە درا؟

٣. بۆچی ناوبانگی لەیلا هەر دەمێنێت؟

٤. لەیلا قاسم لە کۆلیژ چی دەخوێند؟

## چالاکی

١. شەش خوێندکار هەر یەکەو سیفەتێکی چاکی پێشمەرگە باس بکەن.

٢. شەش قوتابی هەر یەکەو کارێکی خراپی بەعسییە فاشییەکان بڵێن.

## داڕشتن

لە سەر ئەم دێڕە هۆنراوەیە دارشتنێک بنووسە:

پیاو ئەبێ دایم خەمی قەوم و وڵاتی خـــــۆی بێ
ئەو کەسانەی بێ خەمن حاش نەوەی ئەم خاکە نین

(بێکەس)

# شەرەفخانی بەدلیسی



شەرەفخان کوڕی میر شەمسەدینی کوڕی میر ئەشرەفیە لە بنەماڵەی میرەکانی فەرمانڕەوایی بەدلیسە، لە ساڵی (١٥٤٢)ز لەدایک بووە و لە ساڵی (١٦٠٤)ز کۆچی دوایی کردووە، هەر لە گەنجییەوە لەماڵی شاکانی ئێران پەروەردە کراوەو لەبەر خوێندن دانراوە و وەکو شازادان بەخێوکراوە. هەموو جۆرەکانی هونەری خوێندووە و تێیدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. مێژوو ناسێکی زۆر لێوەشاوە بووە، بەجۆرێکی وا کاری لە مێژوو کردووە، کە مرۆڤ خۆی بە قەرداری ئەو بزانێت، لە دیرۆکی کوردستان ناوی باوک و باپیرانی خۆی کە میری بەدلیس بووینە بە نەمری هێشتۆتەوە.

پەرتوکی مێژوویی (شەرەفنامە) کە نووسیویەتی کارێکی زۆر مەزنە و بۆ پاداشتی نەنووسیوە و لە کۆتایی پەرتوکەکە دەڵێت من شانازی بەوە دەکەم، کە هاتوومەتە ڕیزی نووسەرانی کوردپەروەر و خزمەتی نەتەوەکەم کردووە. شەرەفخان ئەم پەرتوکە مێژووییەی خۆی بەزمانی فارسی سەردەمی سەفەوی نووسیوە.

مامۆستا هەژار موکریانی شەڕەفنامەی لە فارسی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، ئێستا ئەم شاکارەی شەڕەفخان بۆ سەر گەلێک زمانی جیهان وەرگێڕراوە و شوێنی خۆی لەناو پەڕتوکخانە جیهانییەکاندا کردۆتەوە .

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| بنەماڵە | : | خێزان |
| گەنج | : | لاو، تۆلاز |
| شازادە | : | منداڵی شا |
| لێوەشاوە | : | ژیهاتی، لێهاتوو |
| دیرۆک | : | مێژوو |
| نەمر | : | زیندوو |
| پاداشت | : | خەڵات |

## ڕاهێنان

ئەم ڕستەیەی خوارەوە دووجار لە تێنووسەکەتدا بنووسە:

(من شانازی دەکەم، کە توانیوومە خزمەتی نەتەوەکەم بکەم و هاتوومەتە ڕیزی نووسەرانی کوردپەروەر).

## چالاکی (١)

١. شەش خوێندکار هەر یەکەو سیفەتێکی باش، کە لەناو نەتەوەی کوردا هەیە، یان حەزی لێدەکات بڵێت.

٢. شەش قوتابی، هەر یەکەو سیفەتێکی خراپ کە لەناو کوردا هەیە و پێویستە نەبێت، بڵێت.

## چالاکی (٢)

خوێندکاری خۆشەویست:

هەوڵبدە هەندێک زانیاری لەسەر ئەم دوو دیرۆکنووسەی خوارەوە پەیدا بکەی و لە تێنووسەکەت بینووسە:

١. محەمەدئەمین زەکی بەگ

٢. دکتۆر کەمال مەزهەر

با مامۆستای بەڕێز هاوکاریت بکات.

# ڕێنماییەکانی هاتوچۆ








وەک هەموو چالاکییەکی گشتی، هاتوچۆکردن لە ڕێگاوبانەکاندا کارێکە چەند ڕێنمایەک ڕێکی دەخەن و ئەم هاتوچۆکردنەش بە شێوازێکی ڕێک و دروست شتێکی گران نییە، دیارە پابەندبوون بە ڕێنماییەکان شتێکی زۆر پێویستە، چونکە شار و بازێڕەکانی ئەم سەردەمە بە سەدان هەزارو بەڵکو بە ملیۆنان مرۆڤیان تێدا دەژیت و ئەگەر هەموو کەسێک لە پیادە و مۆتورسواروشوفێری ئوتومبێلان پابەند نەبن بە جێبەجێکردنی ئەم ئامۆژگاری و ڕێنماییانەی کە پەیڕەوکردنیان دەبێتە هۆکاری هاتوچۆکردنێکی ڕێکوپێک لەناو شارەکان، ئەوا هاتوچۆکردن لە شەقام و جادەکاندا دەبێتە شتێکی زۆر سەخت و ئەستەم، بۆیە پێویستە بەر لە هەموو شتێک پابەندبین بە ڕێنماییەکان، بۆ نموونە بەهیچ شێوەیەک نابێت لەسەر شەقام و ڕێگە گشتییەکان یاری و مەشقی وەرزشی بکەین، هەروەها مرۆڤی شارستانی نابێت پاشماوەی زبڵ و پیسایی فڕێ بداتە سەر شەقام و کۆڵانەکان، ئەگەر پیادە بوویت و ویستت لە شەقامێکی پڕ لە ئوتومبێل بپەڕیتەوە پێویستە بەر لە پەڕینەوە تەماشای ڕوناکییەکانی هاتوچۆ بکەیت. ئەگەر سەوز بوو ئینجا بپەڕیتەوە.

لێخوڕینی ئوتومبێلیش چەند مەرجێکی تایبەتی هەیە، یەکێک لەوانە پابەندبوونی شوفێرە بە نیشانە تایبەتەکانی هاتوچۆکردن، لەوانەش ڕوناکییەکانی هاتوچۆ (ترافیک لایت)، ئەوانەی پایسکلسواریش نابێت لە شەقامەکاندا پێشبڕکێ لەگەڵ یەکدیدا بکەن یان باری قورس و خەڵکی دی لەگەڵ خۆیاندا سوار بکەن، جاری وا هەیە پایسکلسوار لەسەر شۆستەکان دەڕوات، یان دەست بە ئوتومبێلەوە دەگرێت و بە دوایدا دەڕوات، دیارە ئەمە مەترسییەکی گەورەی لێدەکەوێتەوە.

مرۆڤی شارستانی و یاسادۆست پێویستە پابەند بێت بە نیشانەکانی پەڕینەوەی پیادە، ئەم نیشانانە بریتین لە چەند هێڵێکی ڕەنگ سپی تەریب، کە لەسەر شەقامەکاندا کێشراون، هەر کاتێک قوتابییان و خەڵکانی دیکەی پیادە لە شوێنە تایبەتەکانی پەڕینەوەی پیادە بپەڕنەوە ئەوا خۆیان لە کارەسات و بەسەرهات دوور دەخەنەوە.

هەموو پایسکل‌سوارێک پێویستە زۆر بە ئاگادارییەوە لێبخوڕێت و بە تەواویش پابەند بێت بە نیشانەکانی هاتوچۆکردن، چونکە پایسکل سوارو مۆتۆرسواریش وەکو شوفێری ئوتۆمبێل وان و هەر هەمان یاسا و ڕێنماییان بەسەردا دەڕوات.

یەکێك لە سیما هەرە دیارەکانی کۆمەڵگەی شارستانی ئەمڕۆ، پابەند بوون و پەیڕەوکردنی یاسا و جێبەجێکردنی ڕێنماییەکانی تایبەت بە هاتوچۆکردنە، هەر کۆمەڵێکیش ئەگەر ئەم پابەندبوونە فەرامۆش بکات، ئەوا تووشی سەرلێشێوان و بێ سەروبەری دەبێت، بۆیە پێویستە هەموومان، بەتایبەتی ئێمەی قوتابی، ببینە پێشەنگ لەم بوارە، بۆ ئەوەی خەڵکانی دیکە چاو لە ڕەفتارە جوان و شایستەکانی ئێمە بکەن و بەم کردەوەش ئەوە بسەلمێنین کە قوتابییان نەوەی دوارۆژی ئەم نیشتمانەن.



## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| چالاکی | : | بزاڤ |
| ئەستەم | : | زەحمەت |
| شۆستە | : | سەکۆی شەقام، پێڕۆی شەقام |
| سیما | : | ڕوخسار |
| فەرامۆش بکات | : | لەبیر بکات |
| سەرلێشێوان | : | سەر لێ تێکچوون |

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. ئەگەر ویستت لە شەقامێک بپەڕییەوە پێویستە چی بکەیت؟

٢. هێڵە سپییە تەریبەکانی سەر شەقام نیشانەی چین؟

٣. یەک لە مەرجەکانی لێخوڕینی ئۆتومبێل چییە؟

٤. ئەگەر ڕێنماییەکانی هاتوچۆکردن جێبەجێ نەکەین، تووشی چی دەبین؟

## چالاکی (١)



ڕوناکییەکانی هاتوچۆ (ترافیک لایت) سێ ڕەنگە، ئەم وێنەیەی بەرامبەر ڕەنگ بکەو هەر ڕەنگێکیش نیشانەی چییە لە بەرامبەریاندا بینووسە.

## چالاکی (٢)

قوتابی خۆشەویست/ هەندێک لەو نیشانانەی کە هاتوچۆ ڕێکدەخەن ئەمانەی خوارەوەن، چاک تێیان بڕوانە و فێریان ببە، لە دواڕۆژدا سوودیان لێوەردەگریت.











## داڕشتن:

قوتابی خۆشەویست چەند دێرێک لەسەر وەرزی بەهار بنووسە.

# تـــــــەپڵ



هەر چیم هەیە لێــم وەرگرە
لەشم، ناوم، جووڵەم، تینـم
بیگروو پێستی ئەندامـــــم
بیکە بە بەیداخی ژینـــــم
بەرەڵایکە هەوری تـــوانج
بۆ ئەستێرەی بەختی ژینم
بەڵام شتێ لە مۆخمایــــــە
(ئەتۆم) نایهێنێتــــــە دەرێ
هیچ دەسەڵاتێ ناتـــوانێ
پەناو زەفەری پێبـــەرێ
ئەزانی چـــی؟ ئەمن کوردم
گەڵای کوردانەم نـــــاوەرێ

دیـــلان

دیلان: - ناوی موحەمەد ساڵح کوڕی مەلا ئەحمەدی دیلانە ساڵی (١٩٢٧ )ز لە سلێمانی لەدایک بووە، تا پۆلی سێیەمی ناوەندی خوێندووە، لەبەر هەڵوێستی مەردانەی توشی گیران و دەرکردن و بەندکردن بووە، ساڵی (١٩٩١)ز کۆچی دوایی کردووە و لە گردی سەیوان نێژراوە.

# هەڵەبجەی شەهید



هەڵەبجە قەزایەکی گەورەیە دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانی و تەنها (شازدە) کیلۆمەتر لەسنووری ئێرانەوە دوورە و لە دەشتایی شارەزوور دایە. لە باکوورەوە چیاکانی (هەورامان)و لە باشوورەوە (باڵامبۆ) و لە ڕۆژهەڵاتەوە (شنرویێ) و لە ڕۆژئاواشەوە دەشتی شارەزوور دەوریان داوە.
ناحیەکانی (سیروان) و (خورماڵ) و (بیارە) سەر بەو قەزایەن.

گەڕەکە بەناوبانگەکانی هەڵەبجە بریتین لە (پاشا، پیرمحەمەد، کانی عاشقان، جوولەکان، سەرا، کانی قوڵکە، شەهیدان، مامۆستایان، شێخ سمایل و هتد....).
هەڵەبجە هەمیشە مەڵبەندی ئەدەب و ڕۆشنبیری بووە و چەندین شاعیرو

نووسەری وەک (مەولەوی) و (نالی) و (تایەر بەگ) و (ئەحمەد موختار جاف) و (گۆران) ی لێبووە، هەروەک مەڵبەندی کوردپەروەری و شۆڕشە یەک لە دوای یەکەکانی کوردستان بووە...
سروشتی هەڵەبجە زۆر جوانەو پڕە لە باخ و باخچەو دارستان و کانی و کەم بەهار هەیە، لە جوانی و قەشەنگی و ڕەنگینی و هێمنی بگاتە بەهاری هەڵەبجە. ئەگەر هەڵەبجەیەک خاوەن ئەم مێژووە بێت، ئەوەندە ڕۆشنبیر و کوردپەروەری تێدابێت و بەم جۆرە جوان و قەشەنگ بێت، بێگومان دەبێت باجی ئەمانەو ئەو هەموو کارەسات و مەرگەساتانەی کوردستانی دابێت.. هەڵەبجە کۆمەڵێ زامی لە دڵدا هەیە و ناکرێ فەرامۆشیان بکەین، دوایین کارەساتیش شەهیدکردنی ئەو شارەیە، کە لە ڕۆژی (١٩٨٨/٣/١٦)ز لە بۆردومانێکی دڕندانەی کەم وێنە (کیمیاباران) کرا و زیاتر لە (پێنج) هەزار مرۆڤی بێ تاوان، بە منداڵ و ژن و پیرو گەنجەوە شەهید کران و زیاتر لە (دە) هەزار بریندارو (دەیان) هەزاریش دەربەدەربوون و شارەکە خاپوور کراو، ژینگەشی پیس بوو.. بۆیە لەو ڕۆژەوە تاکو ئێستا ئەم شارە بە هەڵەبجەی شەهید و (هێرۆشیما) ی کوردستان ناونراوە.
هەڵەبجە شەهید بوو، بەڵام دەبێت ئەوەش بزانین، کە مەرگی ئەو شارە بووە مایەی سەرفرازیی گەلەکەمان و وەک ناسنامەیەکی جیهانیی کوردی بە هەموو لایەکی جیهان ناساند.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
| --- | --- | --- |
| قەشەنگ | : | جوان، جان |
| زام | : | برین |
| فەرامۆشیان بکەین | : | وان ژبیر کەین |
| دەربەدەر بوون | : | مشەختی بوون |
| خاپوور کرا | : | هاتە کاڤل کرن، هات وێران کرن |
| هیرۆشیما | : | شارێکە لە وڵاتی ژاپۆن. |

## ڕاهێنان (١)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:

١. هەڵەبجە تەنها (شازدە) کیلۆمەتر لە سنووری ............ دوورە.

٢. لە کیمیا بارانکردنی هەڵەبجە زیاتر لە ............ هەزار مرۆڤی بێتاوان شەهید کران.

٣. هەڵەبجە لە ڕۆژی ١٦ی ............ (١٩٨٨) کیمیا بارانکرا.

٤. هەڵەبجە وەک ناسنامەیەکی جیهانیی ............ بە هەموو لایەکی جیهان ناساند.

# ڕاهێنان (٢)

نیشانەی ( ✓ ) لەبەردەم ڕستەی ڕاست نیشانەی (X ) لەبەردەم ڕستەی هەڵە لەمانەی خوارەوە دابنێ:

١. کیمیا بارانی هەڵەبجە لە ساڵی ١٩٨٩ روویدا.

٢. هەڵەبجە دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای شاری سلێمانی.

٣. بەهۆی کیمیا بارانەوە ژینگەی هەڵەبجە و دەوروبەری پیس بووە.

٤. حکومەتی هەرێمی کوردستان گرنگییەکی زۆر بەئاوەدانکردنەوەی هەڵەبجە دەدات.

# چالاکی (١)

قوتابی خۆشەویست: لە ساڵی (١٩٨٨)ی زایینیدا، بێجگە لە هەڵەبجە، چەند شوێنێکی دیکەی کوردستان کیمیا بارانکرا، ناوی هەندێ لەو شوێنانە بنووسە، ئەگەر پێویست بوو با مامۆستا یارمەتیت بدات.

# چالاکی (٢)

مەرد     مەردانە

خوێندکاری ئازیز: تۆش ئەم پەیڤانەی خوارەوە وەکو نمونەکەی پێشوو لێبکە:

ژن     ............

کچ     ............

کوڕ     ............

ژیر     ............

بێباک............

# چالاکی (٣)

بە کورتی مامۆستا باسێکی هیرۆشیمای یابان بۆ قوتابییان بکات، کە چۆن لە ساڵی ١٩٤٥ی زایینیدا بە بۆمبی ئەتۆم لێیدرا و وێران کرا، بەراروردیشی بکات بە کیمیا بارانەکەی هەڵەبجە لە ساڵی (١٩٨٨)ی زایینیدا.

# نەجمەدین مەلا



نەجمەدین مەلا کوڕی مەلا غەفووری کوڕی عەلی بە پشتاوپشت دەچنەوە سەر میرەکانی پیرخدری شاهۆ، لە ساڵی ١٨٩٨ز هاتۆتە دنیاوە. چل ساڵ خزمەتی ئەدەبی کوردی کردووە، لە ڕۆژنامەی (ژین) چەندەها چیرۆکی بۆ منداڵان نوسیوە و چەندەها چیرۆکی بێگانەشی کردووە بە زمانی کوردی، ئەمە جگە لە هەوڵدانی بۆ ناسینی شاعیرە بەناوبەنگەکانمان.

نەجمەدین مەلا دوژمنی نەخوێندەواری بووە، بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری زۆر هەوڵیداوە و بۆ ئەم مەبەستە قوتابخانەیەکی بچووکی لە سلێمانی لەسەر شەقامی سابونکەران بەناوی (قوتابخانەی کەشتی نوح)ەوە دامەزراندووە، دژی نەخوێندەواری دەستی بە خەباتێکی بێوچان کرد لە ماوەی چل ساڵدا نزیکەی حەوت هەزار کەسی لە چنگ نەخوێندەواری ڕزگارکرد. ئامانجی ئەوە بوو، بە هۆی ئەم قوتابخانەیەوە هەستی نەتەوایەتی بخاتە مێشکی خوێندکاران، مامۆستا ئەلفبێیەکی تایبەتی بۆ خۆی دانابوو، ڕێنووسی نوێی فێردەکردن. ڕێزی قوتابییانی دەگرت و

دڵێکی فراوانی هەبوو، گرنگی دابووە خۆشنووسین.
ئەم مامۆستا دڵسۆزە خۆبەخشە لە ڕۆژی ٢٣/ مانگی نیسان/ی ساڵی ١٩٦٢ کۆچی دوایی کردووە، لەسەر ڕاسپاردەی خۆی لەسەر لوتکەی چیای ئەزمر نێژراوە، بۆ ئەمەکدانەوەی ڕۆڵی ئەو مامۆستا مەزنە لە شاری سلێمانی قوتابخانەیەک لە گەڕەکی بەختیاری بەناوی قوتابخانەی (نەجمەدین مەلا)وە ناونراوە.

## ڕاهێنان

ئەم بۆشاییانە بە ناوێکی گونجاو پڕ بکەوە:
١. ڕۆژنامەی (ژین) لە شاری .............. دەردەچوو.
(هەولێر، کەرکوک، سلێمانی)
٢. مامۆستا نەجمەدین مەلا قوتابخانەی .............. دامەزراند بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری.
(ئامادەیی، کەشتی نوح، دواناوەندی)
٣. لەسەر ڕاسپاردەی خۆی لەسەر لوتکەی چیای .............. نێژراوە.

( حەمرین، ئەزمر، گارە، هەڵگورد)

# دار و داربڕ *



منداڵە خۆشەویستەکان: ڕۆژێک لە نێو دارستاندا دار و داربڕێک گفتوگۆیان بوو، منیش گوێم لێگرتن تاکو بزانم بە چی دەگات، تاکو بۆ ئێوەی بگێڕمەوە. فەرموون ئێوە و گفتوگۆیەکە.

- دار: (بە تووڕەییەوە، بەغەمبارییەوە) دیسان هاتییەوە، تۆ چەند بێ بەزەیی، دوێنێ قەدی هاوڕێیەکەمت بڕی، ئیمڕۆش دەتەوێ من بکوژی! ئەی نازانیت چەندین ساڵە ڕەگ دادەکوتم، تاکو خزمەتی ئێوەی مرۆڤ بکەم، بەڵام بە داخەوە، چەند داربڕێکی وەک تۆ بێ ویژدان نایەڵن خزمەتی مرۆڤ بکەم.

- داربڕ: (بە توڕەیی و پێکەنینەوە) بۆ خزمەتی چیت کردووە؟ تۆ هەر بۆ سووتاندن و بڕینەوە باشی، من لە ماڵی خۆم و تۆش لەم چیا و چۆلە پێم ناڵێی چ سودێکت بۆ من هەبووە؟

- دار: ئای کە دەبەنگیت، چۆن سودم نییە؟! ئەی تۆ و هەموو مرۆڤەکان بەروبووم و میوە بە تامەکانی من ناخۆن؟ ئەی کە بۆ سەیران ڕوو لەو دەشت و دۆڵە دەکەن، لەژێر سێبەرەکەم پشونادەن؟ ئەی هەر من نیم لەگەڵ گوڵ و گژوگیای هاوڕێم بەهار دەڕازێنینەوە و دڵی مرۆڤ خۆش دەکەین.

* سەلاح سەعدی - لەگوڤاری ژینوار ژمارە( ١ )وەرگیراوە

- داربڕ: قسەکانت تەواو؟

- دار: نەخێر سودێکی دیکەم ئەوەیە، کە جەنابت دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دروست دەکەیت، جا چ بە ئۆتۆمبێلەکەت بێت، یان بەهۆی ئاگری چێشت لێنان و دووکەڵی جگەرەکەت، من بەخێرایی ئەم دووەم ئۆکسیدە پیسە هەڵدەمژم و ئۆکسجینی پاکت دەدەمێ.

- داربڕ: عەیبە تۆ کاتێ چاکەیەک دەکەیت، بە چاوانمی دادەیتەوە.

- دار: من هەرگیز باسی چاکەکانی خۆم ناکەم، چونکە من چەندین ساڵە خزمەتی ئەم وڵاتە دەکەم، چاوەڕوانی سوپاس کردنیش نەبووم. بەڵام تۆ لەوەتەی هەی جگە لە زیان هیچ سودێکی دیکەت نەبووە خۆ ئەو ڕۆژەی قەدی دار هەنجیری هاوڕێمت بڕیەوە، هاتیتە ژێر سێبەرەکەم و حەسایەوە ویستم لقێکی گەورەی خۆمت بەسەر سەردا بەردەمەوە، بەڵام دڵم نەهات، چونکە تۆ لەژێر سێبەری من حەساویتەوە.

- داربڕ: (پاش ئەوەی لە بڕینی دارەکە پەشیمان دەبێتەوە و تەورەکەی فڕێ دەدات و دەڵێت مەرج بێت ئیدی دار نەبڕم، لە جیاتی هەر دارێک کە من بڕیومەتەوە، نەمامێک بچێنم و خۆم بۆ ئاودانیان تەرخان بکەم).

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| غەمباری | : | دڵتەنگی |
| دەبەنگ | : | نەزان و نەفام |
| پشودان | : | حەوانەوە |

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە:

١. ئایا دۆستایەتی لە نێوان دارو داربڕدا هەیە ؟

٢. زیانەکانی داربڕینەوە چییە؟

٣. سودی دار بۆ مرۆڤ چییە؟

٤. سودی دار بۆ ژینگە چییە؟

## چالاکی (١)

وەڵامی ئەمانەی خوارەوە بدەوە:

١. ناوی چەند دارێکی بەردار و بێبەر بنووسە.

٢. جیاوازی داری بەردار و داری بێبەر چییە؟

٣. داربڕەکە لە کۆتای بڕیاری چی دا؟

## چالاکی (٢)

دەتوانن لەسەر گرنگی دار لە ژیان و ژینگەی مرۆڤدا بدوێن.

## داڕشتن

چەند دێڕێک لەسەر ئەم پەندە بنووسە.

(هەر دەوەنە دەبێت بە دار)

# ژینگــــــه



ژینگەی ئێمەی مرۆڤ ئەو شوێنە دەگرێتەوە کە لێی دەژین. ئەو شتانەش کە لە دەوروبەرمان هەن و کاریگەرییان بەسەر ژیانەوە هەیە، وەکو: ئاو، هەوا، خاک، پیسبوونی ژینگە کار دەکاتە سەر تەندروستی ژیانی مرۆڤ و گیاندارانیش، کەمتەرخەمی کردن لە فڕێدانی زبڵ و خاشاک و پاشماوەکان لە کۆڵان و گۆڕەپان و شەقامەکان و نا شیرینکردن و پیسکردنی ڕووی دیوارەکان بەتایبەتی لە قوتابخانە و بازێر و شوێنە گشتییەکان و بایەخدان بە باخچە و دارودرەخت و زۆربوونی دەنگی بەرز و ژاوەژاوە لە شوێنە گشتییەکان و دوکەڵی ئۆتومبێل و کارگە و جگەرە و گەلێ شتی دیکەش، ئەمانە هەموو هۆکارن بۆ ئەوەی ژینگەی جوانی شاری وڵاتەکەمان پیسبکەن.

پێویستە ئێوەی ئازیز شان بەشانی گەورەکان هەوڵبدەن، کە ژینگە پاک و خاوێن ڕابگرن. سەرەتا لە ماڵ و قوتابخانە چواردەوری خۆتانەوە دەست پێبکەن و دەبێت دڵسۆز و خەم خۆری ژینگەکەمان بین.

هەست بە بەرپرسیاریەتی بکەین، لە ماڵ و قوتابخانە و کۆڵان و سەیرانگە و شەقامەکان و خۆمان دوور بخەینەوە لە هەموو جۆرە کاروکردەوەیەک، کە دەبێتە هۆی پیسبوونی ژینگە، چونکە خاوێنی ژینگە و جوانییەکەی، دڵسۆزیی هاووڵاتیان دەردەخات.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| تەندروستی | : | ساخلەمی |
| کەمتەرخەم | : | پشتگوێ خستن، بایەخ پێنەدان |
| ژاوەژاوە | : | دەنگەدەنگ |
| پاکژ | : | خاوێنی |

## ڕاهێنان

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەیەکی گونجاو پڕ بکەرەوە:

١. ژینگە ئەو شوێنە دەگرێتەوە ............

٢. ............ دەبنە هۆی پیسبوونی ژینگە.

٣. پێویستە لەسەرمان ............ ژینگە بپارێزین.

٤. نابێت لە شوێنە گشتییەکان ............ چونکە ژینگە پیس دەکات.

# کۆترو ڕاوکەر

کۆترێکی جوانی خاڵ و مل نەخشین
پەڕ و پۆشین و قاچ و قول ڕەنگیـــن



هێلانەیەکی گەرمکرد بە تـــووك
پووشی بۆ هێنا بە نووکی دەنووك

لەسەر دارێکی بەرزی گـــەڵادار
هێلانەو هێلکە و خۆی تیادا حەشار

دوو هێلکەی کردو کۆتر کەوتە کڕ
پشتیوانی بوو دارستانی چـــڕ

ڕۆژێ ڕاوکەرێ بۆ ڕاو و شـــکار
وردورد دەگەڕا بندار بە بنـــدار

مەلێکی نەدی ڕاوکەر لـــــە ڕاوا
وەخت بوو لێڵایی بێ بەســەر چاوا

ملی ڕێگەی گرت زۆر بە دامـــاوی
بڕوات بۆ ماڵ و بێ کەڵـــکە ڕاوی



کۆتر نەفامبوو بـێ عەقڵ و کەمـاڵ
بەرزی کردەوە مـلی پڕ لە خـاڵ

نەزانین، بـرا، دەردە بۆ هەمووان
دەردی، دەردی سەخـت، دەردی بێدەرمان!؟

خـۆت ڕزگار بـکە زوو لە نەزانیـن
هەتا تووش نەبیت، وەک کۆتری نەخشین

کۆتر دەسـتیکرد بە حاقو حـاقو
ڕاوکەرو ڕاوی هیـچ لە بیر نەبـوو

ڕاوکەر بە دەنگی کۆتـر دڵخۆش بوو
هیلاکی ڕێگەی لا فەرامـۆش بـوو

شێخ سەلام

شێخ سەلام کوڕی شێخ ئەحمەد، کوڕی شێخ عەبدولکەریمە ساڵی ١٨٩٢ ز لە گوندی عازەبان، هاتۆتە دونیاوە، لە چوار ساڵییەوە خراوەتە بەر خوێندن ١٩٥٩ز کۆچی دوایی کردووە و لە گردی سەیوان لە سولێمانی نێژراوە.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| نەخشین | : | ڕازاوە، جوان، نەخشاو |
| تووک | : | وردە پەڕە نەرمەی باڵدار |
| حەشار | : | پەنا، پاسار، شوێنی خۆ مەڵاسدانە |
| کەوتەکڕ | : | کورک بوو، کڕکەوت |
| ڕاو | : | شکار |
| فەرامۆش | : | لەبیرکردن |

## ڕاهێنان

دەنگی مەل و باڵندە، هەر یەکە ناوی خۆی هەیە، کەواتە وشەی گونجاوی ئەمبەر و ئەوبەر بەیەک بگەیەنە، بۆ ئەوەی واتایەکی تەواو ببەخشن.

| دەنگ | گیانلەبەر |
|---|---|
| قاسپە قاسپی | کۆتر |
| گمەگمی | کەو |
| چریکە چریکی | کەڵەشێر |
| گارە گاری | بولبول |
| قووقە قووقی | مریشک |
| قیرەی | قەل |

# كاغەزو چاپكاری



مرۆڤ پێش هەزاران ساڵ بەر لە دایكبوونی حەزرەتی عیساوە دەزانێت بنووسێت، نووسین بە چەند قۆناغێكدا تێپەڕیووە، هەر قۆناغەی ماوەیەكی دوور درێژی خایاندووە، مرۆڤ نووسینەكانی لەسەر تاتە قوڕی زل زل نەخش دەكرد و پاشان تاتە قوڕەكانی وشكدەكردنەوە و هەڵیدەگرتن.

بەمجۆرە وردەوردە ئەم تاتە قوڕانەی كۆدەكـردەوە و پەڕتوك و پەڕتوكخانەی لێپێكەوە دەنا.

پەڕتوكخانەی ئاشوور پانیپاڵ لە دۆڵی دووزێدا (میزۆپۆتامیا)دا یەكەمین پەڕتوكخانە بوو، كە مێژوو بە خۆیەوە دیتبێت.

هەزار ساڵێك بەر لەدایكبوونی عیسا، میسرییەكان گەڵای (پوزەڵ) یان دۆزییەوە و بینیان، كە دەگونجێت لەسەری بنووسرێت، هاتن بابۆڵە پەرەیان لێدروست دەكرد، كە لە كاغەز دەچوو.

هەر لەو سەردەمەش ڕۆمانییەكان و یۆنانییەكان لە تەختەی مۆم سواغدراودا دەیاننووسی و پێستی ئاژەڵیان بەكاردەهێنا، بەڵام كاغەز لە وڵاتی چینەوە پەیدا بوو، پاش بە دیلگرتنی چەند كرێكارێكی كارگەی دروستكردنی كاغەز لە شەڕدا، دروستكردنی كاغەز گەیشتە شاری سەمەرقەند و پاش

ماوەیەک گەیشتە بەغداو دیمەشق.
لەدوای سالانی (١١٩٠) ز گەیشتە فەرەنسا و هەندێک لە وڵاتانی ئەوروپا. دروستکردنی کاغەز بووە هۆی ئەوەی، کە واز لە بەکارهێنانی تاتەقورِ و پێستی ئاژەڵ و تەختەی سواغدراو بە مۆم بهێنرێت، لە نووسیندا، چونکە کاغەز بەکارهێنانی ئاسانترو باشترە و هەڵگرتنی لە نووسین لە بارترە.
سەرەتای سەرهەڵدانی لەدایکبوونی چاپ لەلایەن چینییەکانەوە بووە، کەچاپیان لەسەر تەختە داهێنا و پیتیان لەدارتاشی و لە قورِ دروستکرد و توانییان لە شوێنێکەوە بۆ جێگەیەکی دیکەی ببەن و چاپی پێبکەن.
بەڵام چونکە زمانی چینی گرانە و پیتەکانی زۆرن، هۆکارێکی رِێگر بوون لەبەردەم بڵاوبوونەوەیدا.
تا سەدەی پانزەیەمی زایین، ئەوەبوو ( گوتەنبەرگ ) ی ئەڵمانی لە ساڵی (١٤٤٠ز) توانی پیتی چاپ بدۆزێتەوە، بۆ چاپکردن و پاشانیش مەکینەی چاپی دروستکرد و پەرِتوکی ئینجیلی پیرۆزی پێ لە چاپ دا. ئەم دەستکەوتە مەزنە لەماوەیەکی کەم بە جیهان بڵاوبووەوە و لە هەر لایەک گەلێک دەستکاری بەخۆوە دی و پەرەی پێدرا. ئەمرِۆ بەهۆی پێشکەوتنی زانست و زانیارییەوە توانراوە، مەکینەی چاپی وا دروست بکرێت، کە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بە هەزارەها لاپەرە بە جوانترین وێنە و بە نیگار و نووسینەوە لەسەر خاوێنترین و ناسکترین جۆری کاغەز بە چاپ بگەیەنێت.

دیارە ئادەمیزاد و توانای بیرکردنەوە و وردبوونەوەی، نووسینی لەسەر تاتەقورەوە گەیاندە نوێترین ئامێری چاپکردن و چاکترین جۆری کاغەز.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| چاپکاری | : | کاری چاپ، چاپەمەنی |
| تاتەقوڕ | : | خشتەقوڕی گەورە |
| بابۆڵە | : | لولکراو |
| لەبار | : | گونجاو |

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەوە:

١. پەڕتوکخانە لە کۆندا چۆن پێکهاتووە؟

٢. یەکەم پەڕتوکخانە لە مێژوودا کامە بووە؟

٣. ئایا نووسین هەر لە سەرەتاوە بەم شێوەیەی ئێستا بووە؟

٤. کێ گەڵای پوزەڵی بۆ نووسین بەکارهێنا؟

٥. ئادەمیزاد بە توانای بیرکردنەوە و وردبوونەوە گەیشتە چی؟

## داڕشتن

چەند دێرێک لەسەر (پەڕتوکخانە) بنووسە.

# نـــــــــــەورۆز



نەورۆزە گەلـــێ ئاری

ڕۆژا ئازادیێ هـــــــەلات

بیست و ئێکێ ئــاداری

جەژن و سەرسالْ بون خەلات

باپیرێ مەزنێ ئـــــاری

ئەوی کاوەیێ ئاسنگـــــــەر

ڕوژا گەشا ئازادیـــــــێ

ژتاریا شەڤێ ئینـــــــــادەر

ئاگر هەلکرن سەرێت چیا

ل سەربان ســـــەرێت ڕی یا

گونـــــــــد باژار و کولانا

گەل کەتن شاهــــی دیــــلانا

(شەعبان سلێمان)

ناوی شەعبان سلێمان مەحمودە لە سالّی (١٩٦٥) ز لە گوندی (ئۆرە)ی دەڤەری بەرواری بالّا لەدایک بووە. دەرچووی کۆلیژی شەریعەیە خاوەنی چەندین هۆنراوەی دلّداری و نیشتمان پەروەرییە،

# ناوەرۆک

| ژ بابـەت | لاپەڕە |
| --- | --- |
| ١. پێشەکی | ٣ |
| **بەشی ڕێزمان** | |
| ٢. ڕستە | ٦ |
| ٣. جۆرەکانی ڕستە | ١١ |
| ٤. ڕستە (نیهاد- کار) | ١٦ |
| ٥. ڕستە (بکەر- کار) | ١٩ |
| ٦. تەواوکەر | ٢٢ |
| ٧. کار | ٢٥ |
| ٨. دەمەکانی کار- ئـ کاری ڕابردوو | ٢٨ |
| ٩. دەمەکانی کار-ب کاری ڕانەبردوو | ٣١ |
| ١٠. کاری داخوازی | ٣٤ |
| ١١. کاری تێنەپەڕ و کاری تێپەڕ | ٣٧ |
| ١٢. جێناوی کەسی سەربەخۆ | ٤١ |
| ١٣. جێناوی کەسی لکاو – کۆمەڵی (١) | ٤٤ |
| ١٤. جێناوی کەسی لکاو – کۆمەڵی (٢) | ٤٨ |
| ١٥. ڕاهێنانی گشتی | ٥١ |

| ت | لاپەڕە |
| --- | --- |

**بەشی هۆنراوە و خوێندنەوە**

| | |
| --- | --- |
| بەشی هۆنراوە و خوێندنەوە | ٥٤ |
| خۆشەویستی و تەبایی | ٥٥ |
| ناسنامەی نەتەوە | ٥٨ |
| بەیان (هۆنراوە) | ٥٩ |
| خەڵاتەکانی نۆبڵ | ٦١ |
| مەلامستەفای بارزانی | ٦٥ |
| پەڕتوکێک باسی خۆی دەکات | ٧١ |
| کەچا کورد (هۆنراوە) | ٧٥ |
| جوانـــــــی | ٧٧ |
| ڕۆژنامەگەری کوردی | ٧٩ |
| ماسییە بچکۆلەکە | ٨٣ |
| تۆفیق وەهبی | ٨٧ |
| کۆمپیوتەر | ٩١ |
| سەدەی زانست (هۆنراوە) | ٩٥ |
| لەیلا قاسم | ٩٧ |
| شەرفخانی بەدلیسی | ١٠٠ |
| ڕینمایەکانی هاتوچۆ | ١٠٣ |
| تەپڵ (هۆنراوە) | ١٠٧ |
| هەڵەبجەی شەهید | ١٠٨ |
| نەجمەدین مەلا | ١١٣ |

